
ناوەندی ڕۆشنبیریی

مەم و زین

- ناوی کتێب: حەسەن و مریەم- داستانی بەستی هەنگوین
- نووسەر: کەریم کاکە
- نەخشەسازی ناوەوە: ناوەندی مەم و زین
- نەخشەسازی بەرگ: پەپوولە یوسفی
- مۆتیف: قەرەنی جەمیل
- هەڵەبڕ: سەرکەوت وەلی
- بابەت: ڕۆمان
- نۆبەتی چاپ: یەکەم - ٢٠٢٢
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٨٦٤)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێدراوە.

## ١

هەبوو، هەیە، چ شـتێ لە ئەوین مەزنتر نەبوو، مەزنتر نیە. کچێ هەبوو لە ناو رەنگان سـەرتۆپ بوو، لە ناو میوە سـەرتا بوو، دڵێ بە کوڕێکدا چوو، لە فڕینـدا سەرقەتار بوو. ئەوینی ئەو کچ و کوڕە وێنەی نەبوو. هێ لە بەستی هەنگوین، چ جێ لە زەوی ئەوینی لەو تەرزەی لێ نەڕسکا بوو.

بەسـتی هەنگوین زگی پڕ بوو لە هەنگ و گوڵ، لە شەوبا و نمەی باران، لە کلوو بەفر و جووکە و جریوەی مەل، لە گزنگ و زەردەپەڕ و تریفە. بەسـتی هەنگوین لە فڕین و نیشتنەوە زگی پڕ بوو، هەزار ساڵ لە زگی خۆی هەڵیگرت. هاوینێ بەرەژانی هاتێ، ژانی گرت و لە بەرایی زسـتانێ زگەکەی دانا. ئەوینێکی سـەرتر لە ئەوین هاتە دنیا.

ئەو ئەوینە دەژی، تا ئاسمان نمەیەکی مابێ بۆ زەوی، تا با هەناسەیەکی تێدا مابێ بۆ زەوی، تا مەلێ مابێ بۆ زەوی بخوێنێ، تا گوڵێ بۆ زەوی پێبکەنێ، تا تیسکە تیرۆژێ، تریفەیێ دابەزێتە سەر زەوی، ئەوینی وان دەژی.

داستاننووس، تۆ بێژە من، لە کام سەرە داوەوە بە دوای ئەو ئەوینەدا بچم؟ سەرم تێدا مایە! ئەو داستانە بەرایی هەیە، لێ بنی نایە. ئاوێزانی رووبار و حیلە و بایە، ئاوێزانی...

داستاننووس، ناو لەو ئەوینە بنێ داستانی بەستی هەنگوین. لە زاری منەوە بنووسە: هەر کەسێ زریان لوولینەدابێ، بە ناو بەستەڵەک و سەر شەختەدا رێی دووری نەبڕیبێ، نەیخوێنێتەوە.

هەر کەسێ لە زمانی ئەسپ نەزانێ، هاوڕێیەتی کارمامزی نەکردبێ، نەیخوێنێتەوە.

هەر کەسێ رۆندک و لەخۆدانی کۆتری نەدیبێ، هەر کەسێ وەک سەگ ئەمەکدار نەبێ، نەیخوێنێتەوە، با نەیخوێنێتەوە.

## ٢

پێشتری زۆر جاران رێت کەوتۆتە وێ بەستێ، لێ لەوەتەی بە سەر داستانێکی گەنجینەیی کەوتووی، لە دیدی تۆوە بەست بەستی بەرێ نیە، بەستێکە لە چ بەستان ناچێ.

گەیشتیە بەستی هەنگوین. بەست و بەست لێژبوویتەوە. ئاقارەکە بە دوندەکە دەناسیەوە. رێی ترومبێل نەما. دابەزییت و بە بەری باشووردا هەیپەت لێکرد. خەرمانانە، لێ شەماڵێ هەڵیکردووە، گەرماکەی شکاندووە. ئاسمانیش شین شین، روون روون، لە ئاسمانی خاکەلێوە و گوڵان دەچێ.

تاتەبەردەکەت دیتەوە. لە ناو چەند رستەیەکەوە، وێنەی ئەو دوند و تاتەبەرد و بەستەت بە رەنگێ لە بینایی خۆت نەخشاندبوو، خۆت لە ناو ئاوێنەدا نەناسیەوە، ئەوانە دەناسیەوە. تاتەبەرد هەمان تاتەبەردی ناو گێڕانەوەی پیری گێڕانەوەیە. سەدەیێ بە سەریدا

رابردیە، شـــێوەی نەگۆڕاوە، بەڵام دوندەکەی ئەو بەر، نزمتر خۆ پیشـــاندەدات. بەســـتەکەش، ناوەکەی لێنایەت. ئەو ناوە سەیر شێواوە.

لە ســەر تاتەبەرد مینا پشـیلە هەڵتووتکاوی. ئەو تاتە بەردەی بەر لە سـەدەیێ ئەسـپەشـێ بە دوو سـواری لە بەســـتەڵەکەوە هاتوو، بێنێکی لە ســـەر دابوو. چاوت لە گۆماوەکە بڕی. بیســـت چرکەیێ پێڵووت نەترووکاند. لەو ماوەیە لە قوولایی گۆمەوە کە دەتگوت شـــینایی خۆی لە ئاســـمان خواســـتووە، رەشـــاییەک کەوتە جوولە. هێدی هێدی سـەردەکەوت. لەگەڵ هەر تەکانێ شـێوەی شـتێکی دەگرت. دوو پەنجەیەکی مـابوو بگـاتە رووی ئـاوەکە، رەشـــایی بە رەنگی خۆیەوە بووە مەلێکی گەورە. کات نەما تا لێی وردببیەوە و بیناســـیەوە. ئاخر تۆ دەبوو تا بیســـت بژمێری، نە کەمتر نە پتر. لەگەڵ بیســـت دەبوو ســـەر بەرزبکەیتەوە، چاو لە دوندەکەی ئەو بەر ببڕی و تا بیستی دی بژمێری.

ئێســـتـا برژانگت بە دوندەکەوە گرێداوە و ژمـاران دەژمێری: یەک، دوو، سێ، چوار...

نەگەیشتبوویتە بیست، دیتت مەلی ناو ئاوەکە بە رەنگ و شـــێوەی خۆیەوە وا بە ســـەر دوندەکەوە. هێندەی پێنەچوو، مەل بووە هەڵۆ. هەڵۆیەکی زەرد، هێنـد زەرد

دەتگۆ لە شانەی هەنگوینەوە ترووکاوە و لە زەردەپەڕەوە باڵی گرتووە. هەڵۆی زەرد باڵی لە باری هەڵفڕین کردۆتەوە. تا دێ نزیکدەبێتەوە. دەستت کەمێ درێژتر با، دەگەیشتە دەندووکی. ناسیتەوە، هەوە، هەڵۆی ناو داستانەکەیە. گیانی بەرزەفڕی کوڕە ئەشقیاکەیە. چاوت شل بوو، ترووکاندت، مەل نەما. لە دیتنی تێر نەبوویت.

*دوای جغارەخۆرێ دووبارەی بکەیتەوە، هەڵۆ زەردەکە لە دوندەکەوە پەیدادەبێتەوە.*

گۆتەی پیری گێڕانەوەت بیرکەوتەوە. دیسانەوە چاوت لە گۆماوەکە بڕی. هەمان ڕەشایی دەرکەوت و هەمان مەلی نەناسراو، دیسانەوە لە سەر دووندەکە نیشتەوە و زەردایەتی وەرگرت و بۆوە هەڵۆی ناو داستان. ئەو داستانەی پیری گێڕانەوە گێڕابوویەوە.

سێ چوار جارێ بە شینیی گۆمەکە مەست بوویت. بە دیتنی هەڵۆ زەردەکە شاد بوویت. وەها شاگەشکە بووبوویت، لە سەر تاتەبەردەکە بە دوای هەناسەی ئەسپەشێدا دەگەڕایت. لە ئاسمانێ چاوت لە هەڵۆی زەرد دەگێڕا.

مەستانە هەستایت. چاوت بە بەستەتەکەدا گێڕا. دەتویست ئەو شوێنە ببینیەوە کە ئەسپەکە لێی پەڕیوەتەوە. پەڕییتەوە، داتەوە باسکە سەختەکە. باسک

سۆرکە و لە دووررپا سۆردەچێتەوە، سۆرێکی خەنەیی. ئەو باسکەی دەتباتەوە هێلانەی هەڵۆ، دەتباتەوە ئەشکەفتی ئەوین. هەڵگەڕایت، پێت دەخزی، دەکەوتی. لە هەندێ جێ بە چنگەڕنێ سەردەکەوتی، لێ کۆڵت نەدا. هەڵگەڕایت، باسک تا بڵێی بڵند و باریکە. لە هەندێ جێ هێند باریک دەبێتەوە، بە ئاستەم شوێنی پێ دەبێتەوە. پێت بە هەر لایەکدا بڕوات، خۆت لە کەندێ دەبینیتەوە. تا گەیشتیە نزیک ئەشکەفتی ئەوین کە هێلانەی هەڵۆی لە سەر سەری خۆی بە بەرزایی دوو بەژنێ هەڵگرتووە، زۆرت پێچوو. ئارەقەی شین و مۆرت دەردابوو.

لێرەوە رێ سەختە و رەنگبێ گەیشتن پێی ئەستەم بێ. لەوێ پشووێکی باشت دا. گەڕایتەوە ناو دەفتەری گێڕانەوە کە بە وێرگوڵ و پنتەوە لەبەرتە. ئاوڕت لە بەستی هەنگوین دایەوە و لاپەڕەی بەفرە ئەستوورەکەت هەڵدایەوە. دەفتەری گێڕانەوەی پیری گێڕانەوە کە دیار نیە چ داستاننووسێ لە زاری ویەوە بە تام و خوێی خۆیەوە نووسیویەتیەوە.

داستاننووس، خۆی نەناسندووە. لە بەرایی داستانەکەدا تەنها ئەو چەند دێرەی لە بارەی خۆی و داستانەکەوە نووسیوە:

((ئەو داسـتانە پەڕ نـا پەڕێکی شـانەی هەنگوینە. ئەوینـێکـی لـێـوە دەڕژێ، لە چ ئەویـنـێ نەمـدیتـووە، نەمبیسـتووە. ئەو داسـتانە پەڕ نـا پەڕێکی بوێرییە، بوێرییەک رەگاژۆی ئەوینە. ئەوینێک ئاکامەکەی رۆندک و خوێنە. بوێرییەک لە چ داستانان تەرز و وێنەی نیە. لە داسـتانەکەدا بوێری و ئەوین بە رەنگێ ئاوێزانی ئێکدینە، لە چ داستانان رەنگی نیە.

داسـتان لە تەمەنی من نیە، کۆنە. وەبیرمدێ منداڵ بووم، دایکم زۆر شەوان لە سەر جێ شتێ لەو داستانەی بۆم دەگێڕایەوە. زیاتر بە لای ئەوینەکەدا دەچوو، کەمتر خۆی لە فرمێسـک و خوێنەکە دەدا. لەو سـاڵانەی دوایی کەوتمە سـۆراغی داسـتان. هەر کەسـە و بە شـێوەیێ دەیگێڕایەوە. تێدا مابووم کامیان بنووسمەوە. زۆر گەڕام و زۆرم پرسـی. تا خوا کردی تووشـی ئەو پیاوە بووم. کە خۆی لە نـاو داسـتـانەکەوە هـاتووە و دیـدڤـانە بە سـەریەوە. کاتێ زانی من شـێت و شـەیدای داسـتانم و دەمەوێ بینووسـمەوە، ورد و بـاریـک بۆی گێڕامەوە. منیش وا دەینووسمەوە))

داسـتـاننووس خۆدیکەکەشـی خسـتۆتە چەنـد رستەیەکەوە:

((ئەو نەینۆکە ئاسایی نیە، پڕ رازە. هەر کاتێ لە لاوە تیچاوێکی دەدەمێ، حەسەن و مریەمی تێدا دەبینم. هەموو بەستی هەنگوینی تێدا دەبینم))

دەفتەری گێڕانەوە کە لە سەر بەرگەکەی بە خەتێکی درشت نووسراوە (پیری گێڕانەوە)، تەمەنی نیو سەدەی رێکە. وێدەچێ بە ناو زۆر ماڵسووتان و گۆزەگۆزدا هاتبێ. لێ دەڵێی هەر ئێستاکە نووسراوەتەوە. رەنگی نەگۆڕاوە، پەڕێکی نەگەچراوە. هێ لە لاپەڕەیەک و چەند وشەیێ، هیچی رەشنەبۆتەوە. داستانێکە رەنگی بە شووشتنەوەی کات نەچۆتەوە. وشە وشە بە رەنگ و بۆی خۆیانەوە، بە زایەڵە و زرینگەی خۆیانەوە داستانی بەستی هەنگوین پیشاندەدەن و دەیڵێنەوە.

## ٣

بەفر دایکرد، دایکرد و بیســـت رۆژ تێیکرد و بۆ تاوێ لێینەکردەوە. دوای ئەوەش تاو تاو دایدەکرد. ئەو ســـاڵە ڕێبەندان لە بەفرانبارێ هات. ژیان وەک بڵێی جوولەی لێبڕابێ، وای لێهات. زەوی چل ڕۆژ هێندەی ناولەپێ ڕەشـــایی تێنەکەوت. ئالیک نەما. بزن لە ناو هۆڵ قشـــپلی خۆی دەخوارد. باڵدار و ئاژەڵە کێوی برســـێتی بڕســـتی لێیان بڕی. گورگ و مامز خۆیان رادەستی ئاوایی مریەم کردەوە، لەگەڵ سەگ ئاشتبوونەوە. هرس بە هرسایەتی خۆی بەرگەی بەفری نەگرت. ئەو چەوراییەی بۆ رۆژی ڕەش لە لەشی خۆی دایکردبوو، بەشی نەکرد. پەنای بۆ ئاوایی هێنا. باشـــووکە و ســـوێســـکە و کەو خۆیان بە کۆڵیتی مریشـــکاندا دەکرد. چۆلەکە لە بن گوێســـوانان نەدەحەوانەوە و هاتنە ســـەر کۆشـــی منداڵان و بە دیار ئاگردانەوە هەڵکورمان. تاکە باڵدار بەرگەی گرتبێ، ڕەنگبێ هەڵۆ زەردەکە بووبێ. ئەو ملی بۆ بەفر و ســـەرماوســـۆڵە نەدابێ. هەڵۆ لەو دەمانەی بەفر بێنێکی

دەدا و دنیا بۆ تاوێ ڕووناهی تێدەکەوت، بۆ چەند ساتێ لە ئاسمانێ دەردەکەوت. لە بن بەفریش با، نێچیرێکی دەدیتەوە و هەڵیدەگرت و دەیبرد.

بەفری ئەو ساڵە کارێکی کرد، باڵدار و باڵدار، ئاژەڵ و ئاژەڵ، باڵدار و ئاژەڵ و مرۆڤی پێکدی ئاشتکردەوە. بەڵام وێناچێ مرۆڤ و مرۆڤ پێکبێنەوە. ئاوایی مریەم ئامێزی بۆ باڵدار و بێباڵ کردەوە. تەنها بۆ کوڕە ئەشقیای نەکردەوە. وا دیارە کوڕە ئەشقیا و هەڵۆی زەرد هەر دەبێ بە کێوانەوە بمێننەوە.

بەفر لێناکاتەوە و کەس ماڵەوماڵ ناکات. هەموو لە دوڕ ژۆرێ بە دەوری ئاگردانەوە دانیشتوون. نزای هێوربوونەوەی ئاسمان و توانەوەی بەفر و بەدیارکەوتنەوەی زەوی دەکەن.

لە نیوە شەوێکی وا کوڕە ئەشقیا بە پێدزە خۆی بە ئاوایی مریەمدا کرد. دایکی کە هەر هێندەی گوڵدانێکی لێمابۆوە، زۆری لە خۆی کردبوو، تا پشتی کەمێ قیتبکاتەوە. دەستە لەرزۆکەکانی بۆ ساپیتە دووکەڵاویەکە بەرزکردبووەوە و بە دەنگێک کە لە هی منداڵێکی سێ چوار ساڵە دەچوو، نزای خوێندبوو:

خودایە، خودای ئەو دیوی بەفرێ، خودای سەر هەورێ، چ چاوێ کوڕەکەی منی نەدیبێ. چ گوێیێ دەنگی

پێی کوڕەکەی منی نەبیستبێ. چ زارێ زمانی لە کوڕەکەی من نەدابێ.

وێناچێ نزای دایکە کلۆڵەکە بگیرێ.

ئاخر شەوی دواتر کە بەفر نیو بەژنێ کەوتبوو، لە سێ باری نیوە شەوێ، کوڕە ئەشقیا دەستی گراوێ خۆ دەگرێ و سەری خۆیان هەڵدەگرن. بەفر شوێنپێیانی شاردەوە و کەس نەیدۆزینەوە.

بەر لە ماڵاوایی کوڕە ئەشقیا دایکی لە ئامێز دەگرێت و ماچی دەکات و دەڵێ:

دایێ، من هیچم بە سەر نایێ. بەفر دەرۆستم نایێ. مریەمم لەگەڵ بێ، بەفر دەبێتە خۆڵەکەو، ئەوین سەهۆڵبەندان دەتوێنێتەوە.

دایک بە گریانەوە:

برۆ کوڕم، برۆ، بەفر لە بن پێتان ببێتە پەمۆ، ساردیی هەموو بەفری رێوبانان بێتە لەشی من.

کوڕ:

دایێ، وا مەڵێ، ساردیی تۆش بێتە من، من بەرگەدەگرم.

دایک دەڵێ:

کورم وا چاکە، ئەسپەکە ببەن، ئەو دەربازتان دەکات.

کور دەڵێ:

رەنگبێ ئەو شوێنەی بۆی دەچین، جێی ئەسپی نەبێ.

دایک:

ئێ، کاتێ گەیشتنە جێ، ئەسپەکە بەرەڵلا بکە، دێتەوە.

کور:

بەفرەکە ئەستوورە، دەترسم رێ دەرنەکات و لەدەستمانبچێ.

دایک:

کورم، ئەسپەشێ رێدەرنەکات، ئەنگۆ رێ دەردەبەن!

کور:

وەک گوتم، ئێمە ئاگری ئەوینمان پێیە.

دایکی حەسەن دەست لە ملی مریەم دەکات:

بووکە جوانەکەم، ژنی ئەشقیا دەبێت تفەنگچی و نیشانشکێن بێت. زوو خۆت فێربکە.

مریەم:

وا دەکەم، ناهێلم حەسەن تەنیا بێت.

دایکی حەســـەنیش کــاتی خۆی تفەنگچی بووە. دەگێڕنەوە لە زۆر شـــەڕان شـــان بە شـــانی مێردە ئەشقیاکەی شەڕی کردووە.

بــابی کچە کە لە ســـەر لێواری گۆڕ بوو، چەنـدی کردبووی و کۆشـــا بوو، کچەی پیرانەگیرابوو. نـاچـار هاتبووە رایێ:

بڕۆ، کچم بڕۆ، تۆ لە ســـەر دەســـتووری خودا و پێغەمبەر هی ئەوی و مارەبڕی وی. خودا ئەو بەدفەڕانە بگرێ، زەماوەندەکەت بەو شـێوەی لێهات، بەفر دەتانبات. خودایە، کارێ بکە، کەلێنێ لەو بەفرە بکەوە. دەربـازیـان بکە. خودایە، مەرگی کچە تـاقـانەکەم نەبینم. لە دنیـایێ تەنها ئەوەم ماوە.

کچ خۆی بە سەر بابیدا دەدات و دەڵێ:

بابۆ، خەم لە من مەخۆ. حەســـەن دەمخـاتە بـاخەڵی خۆیەوە. بەفر ســـێ هێنـدەش بکەوێ، رەقهەڵنـایەم. مەترسێ، بەفر بە ئێمە ناوێرێ. من شەوێ دی خەونم بە هەنگوینەوە دی. هەنگوین خۆشیی لە دوایە. خۆت دەزانی خەونی منیش یەکاویەکە و دێتەدی. بابۆ، تۆ خەمی منت نەبێ. من بۆ تۆ سوێدارم.

باب دەستی بە روومەتی کچە داهێنا:

کچم، خەم لە من مەخۆ. هێشـــتا لە دەســـت و پێ نەکەوتووم. دەتوانم نانێک تەڕ بکەم و پیاڵە چایەک لێنێم. بڕۆ...

کچ دەستی بابی ماچکرد:

بـابی مـانگێک نـانمـان هەیە. داریش لە بڕانە. نەهێڵی سـۆبە بکوژێتەوە. خۆت گەرم داپۆشـــە. کاکە میرزاشـــم سەرت لێنابڕێ.

حەســـــەنیش تکای دنیای لە مریەم کردبوو کە خۆی لەو ڕێیە تووشە نەدات و بەگەڵی نەکەوێ. گوتبووی:

ســــوێنـد بە چـاوی تۆ، بە ڕەنـگ و نـاوی تۆ کە گەورەترین ســـوێندی منە. هەرێ دەدەم، دوای توانەوەی بەفر دێمەوە و دەتبەم.

مریەم ملی نەدابوو. ســـوێندی بە ئەوین خواردبوو: بە تەنیا بڕۆی، من نا، گۆڕەکەم دەبینیەوە.

مریەم هەر بۆ ئەوەی حەســـەن ناچار بکات بێتە ڕایێ، گوتبووی:

دڵنیـابە بە تەنیـا بڕۆیت و من نەبەیت، چـاوت بە من نـاکەوێتەوە. لەو دنیـاش نـامبینیەوە. تۆ دیـارە نـاتەوێ لەگەڵ من بژیت.

حەسەن گوتبووی:

هەر چی دەڵێی بڵێ، بەڵام ئەوە نا.

مریەم پێشتریش زۆر جاران گوتبوویە حەسەن:

وا بڕوات من و تۆ هەرگیز بە یەک نـاگەین. دەزانم ئەشقیایی تۆ کۆتایی نایە. بۆیە وا چاکە منیش ئەشقیا بم و پێکەوە ژیانمان بە ئەشقیایی ببەینە سەر.

حەسەنیش وای وەڵامدەدایەوە:

ئارام بگرە، بزانین چۆن دەبێ. ڕێیەکی پێکگەیشـــتن دەبینینەوە. ئەشقیایی بە تۆ ناکرێ.

مریەمیش دەیگۆ:

تۆ منت نەناسیوە...

حەسەن هێ لە ڕۆیشتن ڕێیەکی بۆ نەماوەتەوە. ئاخر ســـەری وی، ســـەر بە ســـەر زێڕ دەکات. چاوچنۆک و نەیارانی توورەگەیێ زێڕیان پیشاندراوە.

ئیدی چەند نووردووە نـانێک و قۆدیە هەنگوینێک و مســـتێ مێوژ و کەمێ قەســـپ و گوێز و دەســـتە جلکێ دەخەنە نـاو بوخچە و توورەگەوە. بوخچەکە بە کۆڵی مریەمەوە، ئەوانی دی لە ناو کۆڵەپشتی کۆڵی حەسەنەوە.

مشـــەما لە خۆیان دەئاڵێنن و لە بەفر دەدەن. وە بیرمدێ مریەم شەرواڵێکی بابیشی بە سەر جلکەکانیدا هەڵکێشا.

٤

بەر لەوەی سەر بە ئەشکەفت دابگریت، ئاوڕت لە باسکەکە دایەوە:

چ ڕێی تێناچێ، بەفر پژدێنێ کەوتبێ و کەسێ بێرەدا سەرکەوتبێ. تۆ بڵێی پیری گێڕانەوە بۆ خۆشکردنی داستانەکەی زێدەگۆیی نەکردبێ! یان هێزی ئەوین ئەستەمیش دەبڕێ؟

دووربینەکەت بە چاوتەوە نا. جێ جێ بست بست ئاقاری بەستی هەنگوینت پشکنی. وشکوبرینگ، هەمووی سۆرک و کەپکە شاخ. لێرە و لەوێ پارچە زەویی بە پووش و پەڵاش. لە جێ جێ بنە قەرەقاجێ، شیواشینکێ. گۆگەمێ. لە ڕۆخ بەستێش زەل و کفر و کرتی. بەست ئاوێکی کەمی بە نازەوە پێدا دەڕۆیی و لێرە و لەوێش گۆمی گچکە، ئەوەی لای تاتە بەردەکە لە هەمووان گەورەتر. دووربینەکەت لە چاو کردەوە و سەرت بادا:

ئەو بەســـتە بەســـتی هەنگوینە! لێرە ئەو بەفرە ئەستوورە کەوتووە و چل ڕۆژ ماوەتەوە؟! سرووشت چ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە!

لە دووربینەوە بە دوای مریەمدا گەڕایت. ئەو گوندە ناوی خۆی هەیە. بەڵام پیری گێڕانەوە لە داستانەکەدا بە مریەم ناوی هێناوە. دیتتەوە، کەوتۆتە دەو بەســتەکە، بە بەری ڕۆژهەڵاتەوە. دوورە، لەوێوە بۆ هێلانەی هەڵۆ ڕەنگبێ دانەرۆژێ بێ. بەڵام لە دووربینەکەتەوە زۆر نزیک دیارە. خانووەکان شـــوێنیان گۆڕاوە و شـــێوەی جـارانیـان نەمـاوە، دەنـا بە مـاڵی هەردوو نەیـارە سەرسەختەکەی کوڕە ئەشقیاکە دەکەوتیەوە.

ماڵی کوشـــتەی مریەم لە دەو بەســـتێ، لە نزیک ئەو تیشە بەردە بوو کە ئێستاش لە شێوەی باڵە فڕۆکە وا بە ســـەر بەســـتەکەوە. ماڵی کوشـــتەی لیرە لە بەرزایی، لە پەرگەی ئاوایی، لە نزیک ئەو ئەشـــکەفتە گچکەیەی لە شێوەی گورگ زاری کردۆتەوە. لە بەر خۆتەوە دەڵێی:

خۆزی نەینۆکەکەی حەسەنیشم دەستدەکەوت. هەوکە دوورنەبوو هەینێی بەســـتی هەنگوینی وەک خۆی پیشاندابایەوە.

بەر لەوەی بچیتە نـاو ئەشـــکەفتەکە، گەڕایتەوە لای پیری گێڕانەوە.

## ٥

کوڕە ئەشـــقیا، هەردوو بەری بەســـتی هەنگوین تا درەنگ پتر بەو ناوە ناویان دەهێنا. نەیاری زۆر بوو. بە خوێنی سـەری تینوو بوون. ئەو لە منداڵییەوە لەگەڵ ئاغا و بەگان شـــانێکی لە ملەدا بوو. بە گژیـانـدا دەچۆوە. چووبۆوە سـەر بابی. هێشـتا مووی لێ نەهاتبوو، عەمبار و کەندووی ئەوانی دەبڕی و بە ســـەر رەشـــوڕووتانی دەبەشـیەوە. مەڕ و ماڵاتی وانی دەدزی، دەیفرۆشـــتن و پارەکەی بە دزیەوە دەدایە نەدار و لێقەوماوان. لەســـەر هەندێ هەندێ کەس بە دز و چەتە ناویان دەبرد. کوڕە ئەشـقیا لە سـەردەمی ئۆسـمانییەکانەوە بە کەژ و کێوان کەوتبوو. تفەنگی ئەشـقیایی لە شـان کردبوو. ئۆسـمانی تەفروتوونا بوون. ئینگلیز هات و بە وڵاتی وەرکرد. ئەو هەر بە ئەشقیایی مایەوە، لۆیێ دوژمنی زۆر بوو.

کوڕە ئەشـــقیا لە هەردوو بەری بەســـتی هەنگوین، خۆشەویست و دڵنشین بوو. خەڵک سوێندیان بە سـەری دەخوارد. منـداڵیـان بە نـاوی ویەوە نـاودێردەکرد. بە دزیەوە نان و ئاویان بۆی دەبرد. کوڕە ئەشقیا یەکپارچە

جەرگ بوو. باکی بە مەرگ نەبوو. رۆستەمێ بوو لەو گۆڕە. نیشانشکێنێ بوو دەرزی هەڵدەگرت. دەڵێن فیشەکی بە هەدەر نەداوە. بە سام بوو. ترسی نەدەزانی. کەس نەبوو رووبەڕوو بکارێ بچێتە مەیدانی. لەشکرێ دەرۆستی نەدەهات. خەڵکیش لە پیلان و داودانانەوەی نەیارانی ئاگاداریان دەکردەوە. بۆیێ هەرگیز پێوە نەدەبوو.

ئەو ساڵەی ئۆسمانی جاڕیاندا:

هەر کەسێ سەری حەسەنی چەتە بهێنێ، بە کێشی سەری وی لیرە وەردەگرێ.

کوشتەی لیرە خولیای سەری حەسەنی کەوتە سەری. سەد داوی بۆ دانایەوە. بەڵام ئۆسمانی بوونە ئاردی ناو دڕکێ و کوڕەئەشقیا هەر بە ئەشقیایی مایەوە. ئینگیلیز هات و لیرەی زیاد کرد، کوشتەی لیرە رشتتر و هارتر بوو.

کوشتەی لیرە پشتاوپشت بە هەژاری و نەبوونی هاتبوو. بە زگێ تێر بە سێ برسی، لە گرانیی گەورەدا منداڵێکی بە بەر چاویەوە لە برسا مرد. زۆری کرد و کۆشا، خۆی بە دار و بەردا دا، دەستی لە نان گیر نەبوو. ناچار ویستی لە رێی سەری حەسەنەوە برسێتی ببڕێتەوە و بۆ خۆی بحەسێتەوە. هەرچەندە چاکەی

حەسەنیشی بە سەرەوە بوو. چەند جاریّ لە گەنمی دزراو بەشی دابوو. کوشتەی لیرە دواتر گوتبووی:

من چاکەی ئەوم داوەتەوە، زوو هێشتا ولآت بە دەستی ئۆسمانییەوە بوو، جارێک بۆم هەڵکەوت بیکوژم، نەمکوشت.

جارێک گۆتمە کوڕە ئەشقیا:

کوشتەی لیرە لە کۆڵ نەکەیتەوە، لە کۆڵت دەکاتەوە. ئەگەر دەڵێی رێت بۆ خۆش دەکەم تا دەستت بیگاتێ.

گوتی:

کوشتنی وی لە ئاوخواردنەوە ساناترە.

گوتم:

ئەدی لەسەر چی راوەستاوی؟

گوتی:

بیکوژم، کەسوکاری هار دەبن و دوور نیە دەست لە دایکم بوەشێنن.

گوتم:

ئێ، دایکت ببە شوێنێکی دوور، تا پارێزراو بێ.

گوتی:

دەسبەرداری ئێرە نابێ. لەو دەو بەستە ڕەگاژۆ بووە، بیگوازمەوە وشکدەبێ.

گوتم:

زۆر دەترسم بە دەستی ئەو پیاوە بچی.

گوتی:

مەترسە، من ناکەومە داوی ئەو ناکەسەوە.

کوشـــتەی مریەم ئەوینی مریەم دین و ســـەرگەردانی کردبوو. بە دەنگێک کە لە بەستی هەنگوین دەنگیدەدایەوە، هاواریدەکرد:

من فەرهادم، بەڵام هێزی کونکردنی شاخم نیە.

کوشـــــتەی مریەم جێپێ و جێپەنجەی مریەمی مـاچ دەکرد. خۆڵی بن پێی ئەوی هەڵدەگرتەوە. بۆنی دەکرد و دەیخســـتە بن بالیفیەوە. پیری دنیای ناردە تکایێ، مریەم نەهاتە ڕایێ. ئاخر ئەو دڵی دابووە کوڕە ئەشـــقیا. چاوی وی هێ لەو کەسی نەدەدی.

کوشـــتەی مریەم دنیای بە گژ کوڕە ئەشـــقیاوە نا. بە هەموو زمانێ لێی پاڕایەوە تا دەســـــبەرداری مریەم بێ. کوڕە ئەشـــقیا بە زمانێکی شـــیرین، لە شـــێوەی بەســـتی هەنگوین شیرین گوتبووی:

+ ڕەنگبێ وا بزانی تۆ لە من پتر مریەمت خۆشدەوێ؟

- گومانی تێدا نیە، گوێت لە بلوێرەکەم ڕانەگرتووە؟

+ با، بەڵام تۆ بلوێری دڵی منت نەبیستووە. من ئەوینی خۆم بە چەشنی تۆ بۆ خەڵک ئاشکرابکەم، دنیا دەسووتێ.

- باوەڕناکەم، من بێ مریەم ناژیم.

کوڕە ئەشقیا دەستی خستبووە سەر شانی کوشتەی مریەم:

+ بڕۆ دڵی مریەم بەدەستبهێنە، هەینێ....

- تا تۆ لە ژیاندا بی، بەدەستنایێ.

+ کەواتە بمکوژە. بەڵام بزانە، مریەم یەک دڵی هەیە. ئەویش لای منە. ئێمە پێکەوە دەمرین.

- هاییداری خۆت بە، دوورنیە ڕۆژێ بێتەســـــەرم و بتکو...

+ ئەویندار ئەویندار دەکوژێ؟!

- لەبەر دڵی مریەم دەســـــتم ناتچێتێ، لێ حەزدەکەم بمری.

کوشـــتەی مریەم لە دڵەوە مردنی کوڕە ئەشـــقیاکەی دەخواست. بەڵام بە دەستی خۆی نا.

ئەو کوڕە بلوورڤانێ بوو. زمانی باڵدار و ئاژەڵیشـــی دەزانـی. کــاتێ فووی بە بلـوێردا دەکرد و پەنـجەی دەبزواند، کەو و سـوێسکە و تیترواسک خڕدەبوونەوە و لە ســـەر ئاوازی وی باڵیان لێکدەدا. هەڵۆ زەردەکەش لە دوندەوە دادەبەزی و ســـێ چوار جارێ بە ســـەریدا دەسـووڕایەوە. مامز نزیکدەکەوتنەوە و دەکەوتنە ســەما. بزنەگەل لە لەوەڕ دەکەوتن و ژنـانە دەکەوتنە ســـەمـا. ئەسپەشـێ نێسکەی دەکرد. بلوێرەکەی کوشـتەی مریەم گریـان بوو، کون کون فرمێســـکی دادەباراند. هەردوو بەری بەســـتی هەنگوین دەیـانزانی بۆ مریەمە. بلوێر بەردی دەتواندەوە، بەڵام مریەم وەک نەیبیستبێ وابوو.

دایکی پێیگوتبوو:

کوڕم، بۆ ئەو کچە ڕەشـــوبرژە خۆت کوشـــت. ئاخر دەڵێی فاتەڕەشـــەیە، تەنها ددانی ســـپی دەچێتەوە. بە من ناڵێی کوێی جوانە.

کوشتەی مریەم گوتبووی:

دایێ، مریەم هەنگوینی ڕەشـــە. تۆ چ لە ڕەنگ دەزانی. ڕەش لە ناو ڕەنگان جوانترین ڕەنگە.

مریەم ڕەنگی ڕەش ڕەش بوو. تــا دڵ بخوازێ، تــا ڕەشی بخوازێ، تا جوانی بخوازێ، ڕەش بوو. چ ڕەشێ!

ئەمن گەلەک جاران کوشتەی مریەمم تی دەکردەوە و ئەوینی مریەم و حەسەنم بۆی دەگێڕایەوە، دەمگوت:

واز لە مریەمی حەسـەن بهێنە. هەوڵدە مریەمی خۆت ببینیەوە. مریەمێ خۆشتی بوێ و بۆت بسووتێ. مریەمێ بە شـمشـاڵی تۆ باڵ بگرێ و لە ئامێزت بنیشـێتەوە. وازبهێنە، برا وازبهێنە. لە نێوان ئەو دوو گوڵە ئەو دوو دڵە خۆت قیـت مەکەوە. مەبە دڕک و بەکرۆکە. ئەگەر وەک من بزانی ئەوانە چ ئەویندارێکن، دەکشێیەوە. ئەوینی ئەوان نە شـمشـاڵ دەرۆسـتی گێڕانەوەی دێ، نە شـەماڵ، نە نمە باران، نە زنە، نە هاژەی بەستی هەنگوین. لە کەلی شەیتان وەرە خوارێ. لە حەسەن و مریەم گەڕێ.

کوشتەی مریەم دەیگۆ:

تۆ چ لە ئەوین دەزانی، ئەگەر وەک من ئەوین لێی دابایت، هەرگیز قسەی وات نەدەکرد. تۆ نەسووتاوی، نا.

لە دڵی خۆ دەمگۆ: ئەو سـووتانەی من دیومە، مەگەر تەنها حەسەن دیبێتی.

لەگەڵ کوشـتەی مریەم زۆرم گۆ، بەڵام وەها گیرۆدە و حەیرانی مریەم بووبوو، هیچی بە گوێدا نەدەچوو.

# ٦

زارکی ئەشکەفت لە شێوەی زاری داپچڕاوە، گچکەیە، دەبێ لە سەر ئانیشک و چۆک بچیە ناوی. کەسێ بەخۆوە و چوارشانە بێ، هەر ئەوەتا پێوەی دەچێ. لە ناوەوە فراوانە. بەرزایی بەژنێ شتێ بەرزتر، بەرینی پێنج شەش پێ، درێژی دوو گەز و نیو دەبێ.

ئەشکەفت هەمان ئەشکەفتی پیری گێڕانەوەیە. لە شێوەی خۆی ماوە، سەد ساڵ بە سەر پیشاندانەوەی ناو گێڕانەوەکە رابردووە. نە سرووشت دەستی لێداوە، نە مرۆڤ بە نیازی شێواندن بە لایدا چووە. ئەشکەفت دەستکردی مرۆڤە. لە شاخ هەڵکەنراوە. هێشتا جێی دەمە قولنگ و تەپشووی پێوە دیارە. کەس نازانێ تەمەنی چەندە.

لە پەرستگەیێ دەچێ پیرۆزیی ئەوینی پاراستبێ. چاو بە هەر لایەکی دەگێڕیت، وێنەی دوو ئەویندارەکە دەردەکەون. لە سەیرکردنیان تێرنابیت و زوو بزردەبن. لە هەر سەیرکردنێ وێنەیەکی خۆیان پیشاندەدەن و

دەیشـــــارنەوە. بە دیتنی وێنەکـان کەوتیە بـارێکی وا، باوەڕت بە چاوی خۆت نەدەکرد. برووسـکە ئاسـا بە ناو پەڕ پەڕی پیری گێڕانەوە تێپەڕییت. لە چەند دێڕێ باسـی لە پیشـــــانـدانەوەی وێنەکـان کردبوو. بەڵام تۆ وات خوێنـدبۆوە کە بۆ خۆشـــکردنی داســـتـانەکەیە. بۆیە هەســـتتکرد کەوتوویتە خەیاڵەوە، یان خەون دەبینیت. چـاوت هەڵگلۆفت. ســـەرێکت بە دەرێدا داگرت. نا، نە خەونە نە خەیـاڵ. ئەوەی دەیـبـیـنـیـت راســـتـیە. لە داستانەکەش راستتر.

ئەهـا، لە تەنیشـــت یەکتر راوەســـتاون. کچە چوار پەنجەیێ کورتتر دەنوێنێ. کوڕە دەسـتی لە سـەر شـانی کچەیە. کچە دەســـتی لە کەمەری کوڕە ئەشـــقیایە. لەپڕ وندا دەبێ. وێنەیەکی دی دەردەکەوێ. وەک ماری ئاشـقە و ماشـقە تێکئالاون. زوو بزر دەبێ. لە شـوێنێکی دی خۆ پیشـاندەدەنەوە. بە دیار ئاگردانێکی گچکەوە دانیشـتوون. پشـکۆکان دەگەشـێنەوە. روخسـاری کچە و کوڕە جوان رووناکدەکەنەوە.

کوڕە ئەشـقیا زەرد زەرد، زەردی هەنگوینی. دەڵێی لە شـــانەوە رژاوە و زەردەپەڕ لێی داوە. گراوی ئەشـــقیا رەش رەش، رەشـی هەنگوینی. لە رەشـی بریسـکەی دێ، چ بریســـکەیێ! دەڵێی هەرچی جوانیی رەنگەکـانە لەودا تواونەتەوە. هەر کەسـێ گۆنای رەشـی وی ببینێ، لە ناو

هەموو ڕەنگـان ڕەش هەڵدەبژێرێ. ڕەش دەبێتە ڕەنگی دڵخوازی وی. ئەو ڕەشـــیەی لە گۆنـای مریەمەوە دەبریسـکێتەوە، سـەرتۆپی هەموو ڕەنگانە. چ ڕەنگێکی جوان و شـیرینە. هەر دەبێ هەنگوینی ڕەش شـیرینی و ڕەنگی خۆی لە ڕوخساری ویەوە خواستبێ. حەیف زوو بزر دەبێ و ناهێلی لە جوانی و شـــیرینی ڕەنگی ڕەش تێربین. وای! ئەو کوڕ و کچە لە وێنەوە، وێنەی نـاو ئەشـــکەفتی ئەوینەوە، هەردووکیـان زادەی هەنگوینن. هەنگوینی ڕەش و زەرد، هەنگوینی بەستی هەنگوین.

وێنەیەکی دی بۆ تـاوێ دەردەکەوێ. هەردووکیان لە گژ چاکردنی مەلێکن. ئەگەر کەو نەبێ سـوێسـکەیە. ئەو نێچیرە هەر دەبێ دیاریی هەڵۆکە بێ. ئەها دوو چاوی پڕ فرمێسکی کارمامزێ دەرکەوت.

لە هەر لادیوارێکی دەلاقەیەکی سێ سووچی هەیە. لە یەکیان چاوێکی ڕەشـــی برژانگ درێژی پڕ هەڵدێ. لەوی دی دەم و لێوێکی پشـــکوژی. هەر دەبێ چـاو و لێوی مریەم بن. لە دەلاقەی سـێیەم دەم و چاوی حەسـەن بە گچکەیی هەڵۆ ئاسا دەڕوانێ.

وێنەکـان بە دوای یەکتردا بۆ تـاوێ دەردەکەون، بزردەبنەوە. وێنەی منداڵکارێ دەردەکەوێ، ڕاوەسـتاوە، کز دیارە. تفەنگەکەی شـتێ لە بەژنی خۆی کورتترە. لە

لای دەرگاوە سەگێکی زەرد پرێسکەیەکی بە زارەوەیە. ئەھا لەو سووچە کە داوەتەنە لەگژ چنینی تەونی خۆیەتی، لە ناو تەونەکەوە جووتێ مەمک سەرەدیقانێت لەگەڵ دەکەن. لە شێوە بەھێ، لە رەنگ قەتران، ھەر دەبێ مەمکی مریەم بن.

ئەشکەفتی بن ھێلانەی ھەڵۆ دوای سەدەیێ بۆنی ئەوینی لێدێ، بۆنی بەستی ھەنگوین. وێنە وێنە ئەوین پیشاندەدەنەوە. تۆ چیت بەسەرھاتووە، داستانەکە شێتت نەکات!

لە ئەشکەفتی ئەوین دێیتە دەرێ. سەر بۆ ھێلانەی ھەڵۆ ھەڵدەبڕیت. رێی گەیشتن سەختە. ھەڵۆ جێیەکی وای ھەڵنەبژاردووە، مرۆڤ وا بە سانایی بیگاتێ.

بە سەر ئەشکەفتەوە سێبەرێ دەرکەوت. سەرەتا وات زانی سێبەری خۆتە. ھەو نەبوو ئەسپ دەرچوو. دوو سواری لە سەر پشت بوو. ئەسپ ھەستاوەتە سەر پاشوو. پشتت تێکردن، دوای کەمێ ئاوڕت لێدانەوە، نەمابوون.

ویستت بە رێی ھاتنی دوو ئەویندارەکە بەرەو گوندی مریەم شۆڕببیەوە. سەیری خۆرت کرد، تەواو لاربۆتەوە. درەنگە و تاریکیت بە سەردا دێت. ناچاری بگەڕێیتەوە، سەردانی ئاوایی بۆ سبەینێ ھەڵگریت.

لە ڕێیێ بەر لەوەی بگەیتە ئەو دووڕیانەی یەکیان دەتباتەوە گوندی هەنگەوان، ئەوی دی دەتهێنێتەوە شار، لە نەینۆکەوە دیتت سێبەرێ بە دواتەوەیە. هەستتکرد داستانەکە داگیریکردوویت و کەوتوویتە خەیاڵەوە. چاوت لە سەر نەینۆک هەڵگرت و داتەوە ڕێی خۆت. تەواوێ هاتی، سێبەرەکە گەیشتە تەنیشتت. جامت کردەوە، سەرت هەڵکێشا، سێبەر کەمێ دوورکەوتەوە. سێبەر شێوەی ماینێکی گرت، سوارێ بە سەر پشتیەوە. سوار شان بە شانی تۆ ڕووەو شار ماینی تاوداوە. ئیستاپت دەگرت، جڵەوی توند دەکرد. پێتلێدەنا، ئاوزینگی لێدەدا.

ئەو سوارە سێبەرییە هەبێ نەبێ پیری گێڕانەوەیە، بۆ سۆراغی حەسەن و مریەم دەچێ! ترومبێلت ڕاگرت. کەمێ هاتیەوە سەرخۆ. وا بڕوات داستان دینت دەکات! وا چاکە ئاگات لە خۆت بێت و هێندە تێکەڵی داستانی بەستی هەنگوین نەبیت.

ئەو شەوە بەر لەوەی خەو بتباتەوە، جارێکی دی ئەو چەند دێرەت دەورکردەوە کە وێنەکانی ناو ئەشکەفتی ئەوین پیشاندەدەنەوە. ئەوجا چاوێکت بە لاپەڕەی جوانیی مریەمدا گێڕا.

خەوتیت و خەونت بە گۆزەی پڕ خوێنەوە دی. لە سەر شانی کچەکەوە دەچۆڕایەوە سەر سینە و بەرۆکی گوڵنیشانی کوشتەی رەنگی مریەم.

تۆ لە دەستتچوو، بەر لەوەی خولگەکە بە کچ و گۆزەوە تەختبکرێ، تیر لە گۆزەکە وردنەبووبوویەوە.

## ٧

من و مریەم ئاوزەی ئێکدی بووین. ئەو لە خاکەلێوە چاوی گەشــی بە بەســتی هەنگویندا هەڵێناوە، منیش لە بەفرانباری بەر لەو بەهارە. منداڵیمان بە تەنیشت یەکەوە لە دەو ئەو بەستە بەسەربرد. هێند متووی ئێکدی بووین، زۆر شـەوان لەماڵیان دەمامەوە و لە سـەر یەک سـەرین دەخەوتین.

دایکم دەیگێڕایەوە:

کاتێ مریەم هاتە دنیا، هەر بابی نا، داکیشــی لە خۆی کەوتە گومان. داخوا ئەو منداڵە رەشــــوبرژە لە چ پیاوێ بێ! لێ کەس گومانی بۆ کەس نەدەچوو. ئاخر لەو ناوە چ پیاوێ نەبوو، ئەو رەنگەی هەبێ. کەس وەبیری نایێ، پیـاوێکی لەو رەنگەش بۆ شــــەوێکیش رێی بەو نـاوە کەوتبێ. هەبێ نەبێ ئەو کچە لە جندۆکەیە! ئاوایی ســـەر دەهێنن و دەبەن، ســـەرەدەری لەو رازە دەرناکەن. دوایی بـابی بیریـدەکەوێتەوە، نەنکە گەورەی کە نـاوی مریەم

دەبێ، گوایە هەمان ڕەنگی دەبێ. بەوە دڵی ئاو دەخواتەوە، گومان دەڕەوێتەوە، توند لە ئامێزی دەگرێ و بە ناوی نەنکیەوە ناودێری دەکات.

مریەم تا گەورەتر دەبوو، جوانیەکەی جوانتر دەردەکەوت. ڕەشیەکەی ڕەشتر گەشتر، شیرینیەکەی شیرینتر، ورد و درشت پێی سەرسام دەبوون. ڕوومەتیان لە ڕوومەتی دەخشاند و نزایان دەخوێند ڕەنگی وی بگرن. من لێی دەپاڕامەوە:

توخدا، کەمێ لە ڕەشیی خۆتم بدێ.

پێدەکەنی و دەیگۆ:

بە خودا بڵێ با ڕەنگمان بگۆڕێتەوە.

پێشترێ لە ئاوایی ڕەشی تەنها لە چاو و برۆ، لە کەزی جوان بوو. لە مریەمەوە، لە ڕوخساری مریەمەوە ڕەنگی ڕەش جوانیەکی وەرگرت، لە هەموو ڕەنگان جوانتر، شیرینتر. ئەو ڕەشیەی مریەم هەیبوو، لە چ ڕەشێ نەدەچوو. گەش گەش، ڕوون ڕوون، تەنک تەنک، مێوژی سپیی خواردبا، لە گەردنیەوە دیار دەبوو.

مریەم پارچەڵە بوو، تازە مەمکی کردبوو، کوڕوکاڵی بەستی هەنگوین بۆی شێت و سەرگەردان بوون. منیش یەکێ لەو سەرگەردانانە. ئێمە زۆر هاوڕێ بووین، ئەو بە

منی دەگۆ کاکە، شەرم زارمی بەستبوو، رازی دڵمی بۆ بکەمەوە، ئاخر ئەو منی بە برای خۆی دانابوو، چۆن رووم دێ...

دایکم کاتێ لە چاومەوە دڵمی خوێندەوە، تێکچوو. بە بیریهێنامەوە، هەرچەندە پێشتریش باسی ئەو بابەتەی بۆم کردبوو، بەڵام من بە هەندم وەرنەگرتبوو. نەشمدەزانی گوناحە. سەرمی بە سینەی خۆیەوە نا، ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

کوڕم، لەبیرتنەچێ، تۆ دەزنوێژت لە مریەم ناشکێ. ئێوە خوشک و برای شیرین. من شیرم کەم بوو، تۆ هێندەی مریەم شیری دایکی مریەمت نۆشیوە. بە یەکەوە لە ئامێزی وی هەر یەکە و مەمکێکتان دەمژی. تۆ بە شیری وی رسکاوی.

بەو وەبیرهێنانەوەیە دڵمم لە بن بەردی لەبیرچوونەوە ناشت. دواتریش کە پێکەوتم لەگەڵ کوڕە ئەشقیا دڵیان بە یەکەوەیە و سۆزیان پێکدی داوە، بۆ من بووە خوشکی راستی. پێناویشم بۆ دەکردن. ماوەیێ جێی سەگەکەم بۆ گرتبۆوە. دێڵەسەگێکی تووک زەردیان هەبوو. زەرد وێنەی بژی ئەسپەشێ و قژی کوڕە ئەشقیا، ناویشی زەردە بوو. زەردە هەر بە ناو سەگ بوو. تەنها لەوە لە مرۆڤ جیا بوو لە سەر چوار پێ دەڕۆیشت.

زەردە پێیەکی لە ئاوایی، پێیەکی لای کوڕە ئەشقیا. دایکی کوڕە ئەشـــقیا چەندان جار شـــەوان دوور لە چاوان، پڕێسـکەیەکی پڕ لە خواردنی بە ملەوە دەکرد. دەسـتێکی لە پشـــتی دەدا، زەردە دەیقووچاند. شـــەوی دوایێ بە پڕێسـکەی بەتاڵ و نیشـانەیەکی حەسـەنەوە دەهاتەوە. نیشانە تیلمێ بوو لە پژدێنی گوڵگوڵیی حەسەن. تا سـەگ دەهاتەوە، دایک دڵی سـەیار بوو. زەردە دەهاتەوە، دایک لە ملی دەکردەوە و تێر بۆنی دەکرد. زەردە ساڵ و شتێ تەتەری نێوان دایک و کوڕە ئەشـقیا بوو. تەتەری نێوان مریەم و کوڕە ئەشـقیا بوو. پێناو بوو، کوڕە ئەشـقیا بە ملی زەردەدا گەردانەی بۆ مریەم دەنارد. گەردانە بەهاران لە گوڵە خەزێمە و حاجیلە، هاوینان لە ڕەشـــەڕێحانەی کێوی، پـایزان لە گوڵە جووتیـارە. گەردانەکەشـــی بە تیلمـاســـکێ لە پژدێنە کودەریە گوڵگوڵیەکەی خۆی دەهۆنیەوە. زســـتانانیش گوڵی وشـككراوە، تێکەڵەیێ لە هەرچی گوڵی بەســـتی هەنگوینە. مریەمیش دەســـرۆکە، چەند داوێ لە بسـکی شـۆڕی خۆی کە ڕەنگی شـاپەڕی ڕەشـوێرەیان هەبوو. خۆدیکەکەشـی هەر بە زەردەدا بۆ ناردبوو. ئەو خۆدیکەی دواتر کەوتە لای من و ئێسـتاش لێیەوە هەنگینێ دەبینم.

جارێ لەو جارانە کوشتەی لیرە بەوەی زانی. شەوێ کەوتە دوای زەردە. کوڕە ئەشـقیا بە فیشـەکێ پێشـوازی

لێکرد. گوللەکە شانی راستی گرتبوو. سێ مانگەی زستانێ لە ناو جێ کەوت. دواتر تۆڵەی خۆی لە زەردە کردەوە. بە دوو فیشەک ساردیکردەوە. زەردە قرووسکانێ قرووسکاندی، تا درەنگیش لە گوێی ئاوایی دەنگیدەدایەوە. مریەم شیوەنێکی بۆ کرد، کەس بۆ کەسی نەکردووە. ژنی ئاوایی دەیانگۆ:

ئەدی ئەگەر حەسەنی بمرێ، دەبێ چ شیوەنێ بگێڕێ؟!

لە سەر داخوازیی مریەم، زەردەم ناشت. گوتی:

چۆن دەبێ لەو گۆڕە بڕزێ و بۆگەن بێ. حەزدەکەم گۆڕی هەبێ.

زەردەم راکێشا و لە خوار ئاوایی لە رۆخی بەست، لە نزیک داربییێ، زەویم چۆکێ هەڵکەند و ناشتم. مریەم بەردی زەرد و رەشی کێشایەوە، بە دەوریدا رەمەندێکی بازنەیی چێکرد. تا لافاوی دووەمی نووح هەستا و بە داربیەوە رایماڵی و شوێنەواری نەما، ناوە ناوە دەچووە سەر گۆڕی زەردە و بە چاوی پڕ خوێنەوە دەهاتەوە.

زەردە گوجیلەیەکی لە پاش بەجێما، بەڵام تەنها لە رەنگ لە دایکی دەچوو.

مریەم تەمەنی گەیشتبووە چواردە و پازدە، جوانیەکەی لە هەردوو بەری بەستی هەنگوین

دەنگیدایەوە. لێرەوە گوند ناوی گۆڕا. بەر لەوە ناوێکی ئۆسـمانییانەی هەبوو. بەر لە ئۆسـمانییانیش ناوێکی خۆمـانەی هەبووە. بیرمنـاکەوێتەوە چ نـاوێ بوو. لەو سالانەی دواییش ناوێکی ئارەویی بە سەردا بڕا.

خودایە، چ بەژنێکی زراڤی هەبوو. چ چاوێکی مامزی، چ برژانگێکی رەژگوڵی، چ برۆیەکی کەوانی، چ دەم و لێوێکی فسـتقی، ددان برنجی چ لووتێکی قەسـپی، چ گەردنێکی کێلی، چ پێکەنینێکی شیرین، لە ساتی پێکەنینێ، روومەتی دوو چاڵی گچکەی تێدەکەوتن، هی ئەوە بوو بمری و هێنـدەی هەنگێکـت لێ بمێنێتەوە و لەو چـاڵە بتنێژن. چ پرچ و کەزیەکی لاولاوی، رەش لە رەنگی پەڕی رەشـوێرە، کاتێ بەریدەدانەوە، دەگەیشـتە سـەر رانی. لەنجەولارێکی هەبوو، ئەسـپ و ماین چاویان لێدەکرد. تـاوس بە دیـاریەوە دەحەپەسـا. لە چـاوی منەوە ئەو شـەنگەبیە بوو کە لە بەردەم ماڵیان لە رۆخ بەسـتێ، هاوینان بە بای شەماڵێ دەشنایەوە.

مریەم ئەو جوانە بوو، گوڵنیشـانی کیژی مووشـێی شـێت کرد. ئەو کچەی کە تێگەیی بە جوانیی وی ناگات، رەنگی وێنەی رەنگی وی لێ نـایەت، بە جـادە و کۆلان کەوت. لەو سـالانەی دوایی، لە خولگەی کچ و گۆزە زیلێ پانیکردەوە و چەند دڵۆپە خوێنێکی پەڕیە سـەر گۆزەی

سەر شانی کچەکە. ئێستاش ئەو پەڵە خوێنانە دیارن و چ بارانێ نەیشووشتنەوە.

وای خودایە، داخوا چەندێ بیرتکردبێتەوە، چەند پێوەبوویی، تا ئەو جوانەت بە بەستی هەنگوین بەخشی! تەحا، لە جوانیی مریەم!

مریەم جوانێ بوو، لاو نەبوو چاوی لەسەر نەبێ. زۆر کەس چاویان تێبڕیبوو. هەبوو ئەگەر ترسی حەسەنی نەبا، دەیرفاند. ئاخر دەیزانی بە هەر رێیەکدا بڕوات، حەسەن دەگاتە سەری و بە دەردی رەڤیڤانی دەبات. ئەو رەڤیڤانە کە خەڵکی گوندێکی ئەو بەری بەستی هەنگوین بوو، دەمێ بوو دەور و سوڕی مریەمی دەدا. وەبیرمدێ دەمەو پایز بوو، سەر لە ئێوارەیێ، لە خوار ئاوایی گوێم لە هاواری ژنێک بوو. بە هاواری مریەم دەچوو. غارمدا، تا گەیشتمێ دوو سوار دەرپەڕین. کەوتمە دوایان، دەمزانی نایانگەمێ، بەڵام چ چارم نەبوو، هەر دەبوو بە دوایان کەوم. گوێم لە تەقەیێ بوو. لە دوورەوە چاوم لێیە سوارێکیان کەوت، ئەویدی راوەستا. ناسیمەوە، رەڤیڤانەکە بوو. دەستی مریەمی بەستبوو و لە پێش خۆی سواری کردبوو.

بابێ بابم حەسەن، لە کوێوە خودا بۆ مریەمی ناردی. تا گەیشتمێ بە قۆنداخە تفەنگان کەوتبووە سەریان و

هەردووکیانی لە پەلوپۆ خستبوو، گوللەیێ بە سەری ماینەکەی دی کەوتبوو. لەو گۆڕە کەوتبوو. خوێنی لە بەر دەڕۆیی و لنگی دەدا. حەسەن بە پشتێنی خۆیان دەستی هەردووکیانی بەست. گوتی:

خوێنی ئەو ماینەش لە ئەستۆی ئێوەیە.

هەیهایەکی لە ماینەکەی رەڤیڤان کرد و گوتی:

بڕۆوە ئاوایی و پێیانبڵێ سوارەکەمیان برد تا نالی بکەن.

رووی لە من و مریەم کرد:

ئێوە بڕۆنەوە، ئەوانە بۆ من لێگەڕێن.

مریەم گوتی:

حەسەن، رێمبدە منیش بێم، ئیدی لەگەڵ تۆ دەبم.

حەسەن گوتی:

گیانی من، کاتی ئەوە نەهاتووە، پەلەت نەبێ.

بواری نەدا هیچ بڵێین، ئێمە گەڕاینەوە و ئەویش هەردوو پیاوەکەی پێش خۆی دا. بە هەورازەکەدا هەڵگەڕان.

پاشـــتر پێکەوتین، لە چۆڵەوانیی پشـــتەوەی هێلانەی هەڵۆ، شـــوێنێکی وا کە راوچیش رێی بەوێ ناکەوێ، هەر یەکەیان بە پێوە لە بنە دارێ دەبەســـتێتەوە. بە شـــێوەیێ بواری خۆ نووشتانەوە و جوولەیان نەبێت و پێیگوتوون:

تا یەکەم باران لێتان نەدات، جێی ئێوە ئێرەیە.

دەکەونە پاڕانەوە، دەگریێن، حەسەن دەڵێ:

من ئەو ماوەیە لەو نزیکانە دەمێنمەوە. گوێم لە دەنگ و هاوارتان بێ، ســـــەر و گوللە بە ناو دەمتانەوە دەنێم. خەمیشـــــتان نەبێ، نە دەهێلم لە برســـــا بمرن، نە دەعبا بتانخوات.

رۆژی جارێک ســـــەریان لێدەدات و بە دەســـــتی خۆی ســـــەر و دوو نان و و جامە ئاوێکیان بە زارەوە دەکات. پێیاندەڵێت:

ئەگەر تەنگاو بوون، هەر بە پێوە و لە شـــوێنی خۆتان بیکەن. وەک گوتم کردنەوەی ئێوە بە ئاســـــمانەوە بەندە. نزابکەن پەلە هەورێ بێت و داکاتە بارانێ.

لە بەختی ئەوان دوای حەفـــت رۆژ نەرمە بـــارانێ دادەکات. حەســـــەنیش دیارە لە ســـــەر ســـــۆزی خۆیەتی، دەستیان دەکاتەوە و پێیاندەڵێ:

سێ رۆژتان لە پێشە، لە ئاقاری بەستی هەنگوین بتانبینمەوە، نێوچەوانی ئێوە و دوو گوللە لە منەوە.

ئیدی کەس ئەو دوو کەسەی نەدیتەوە. سەربردەکەش ئاوایی ئاوایی کەوتە سەر زاری ورد و درشت. لەو رۆژەوە کەس نەیوێرا بیر لە رفاندنی مریەم بکاتەوە.

کوڕە ئەشقیام زۆر خۆشدەویست. بە دڵ حەزمدەکرد ئەو دوو دڵە بە یەک بگەن. هەر من دەزانم گڕی چ ئەوینێ دەیسووتاندن. بەڵام هەینێ کەم کەس بە گڕ و دووکەڵی دڵی وانی دەزانی. لە هەردوو سەردەمی ئەشقیایی باسوخواسی یەکترم بۆ دەهێنان و دەبردن. دوایوەی ئینگلیز ئۆسمانیی راوناو و وڵاتبەدەری کرد، کوڕە ئەشقیا هاتە داخوازی مریەم. بابی مریەم کە کچەکەی لە چاوی خۆی خۆشتردەویست، گوتی:

مریەم دەست لە سەر کێ دانێ، ئەوە و تەواو.

لێکدی مارەکران، لە سەر گواستنەوە بوو، لەگەڵ ئینگلیزیش تێکیدا. ملی بۆ زۆرداریی ئەوانیش نەدا، ئیدی وا کەوتەوە.

دوای مارەکردن و ئەشقیابوونەوەی کوڕە ئەشقیا، ئەوینی ئەو دوو ئەویندارە بە شێوەیێ لە بەستی هەنگوین دەنگیدایەوە، بووە هەقایەتی شەوانی پایز و زستان. کەوتە سەر زاری ورد و درشت.

ڕەنگبێ لە زاری مریەمەوە بووبێ، کەوتە سەر زاری کچ و ژنی ئاوایی و لە زاری حەسەنەوە ئاوایان دەگێڕایەوە:

ئێوە ئەگەر نایبینن، بە چاوی من چاودەنێ، مریەم لە هەر وەرزێ بە ڕێدا بڕوات، لە شوێن پێی گیا چووزەرە دەکات، گوڵ دەڕوێت. گوڵ لە هەموو ڕەنگێ جوانترینیان گوڵی ڕەش، دەو ڕێ، ڕێی مریەم مەست و حەیرانت دەکات لە بۆنی مێخەک و شەوبۆ و وەنەوشە و ڕەشەڕێحانەی تەڕ. ئەگەر نابیستن، بە گوێی من هەستراگرن، لە درەخت و بەردەوە، چپە و پێکەنینی ناسکی مریەم دەبیستن.

لە زاری مریەمەوە ئاوایان دەگێڕایەوە:

حەسەن لە هەموو شوێنێکە. ڕوو لە هەر لایەک بکەم لەوێیە. هەر بایەک لە هەر لایەکەوە هەڵبکات، دەنگی حەسەن دەهێنێ. وەرن خۆ بدەنە بەر بای وادە، بای وەشت، بای داراوس، بای شەماڵ، هەناسەی حەسەنی تێدایە. حەسەن لە وەرزی باریندا دەگاتە ناو هەور و لەگەڵ دڵۆپە باران و کلووی بەفردا بە سەر ئاواییدا دەبارێ. تەنها من حەسەنی باریو دەبینم.

وایە، ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە وێنەی ئەوان، دەنگ و پێکەنینی ئەوان، بۆن و بەرامەی ئەوان دەبینی و

دەبیســـتی و بۆن دەکەی. بڕۆ دێی مریەم، لەوێوە بڕوانە ئەو کەپکە شـــاخەی کە شـــێوەی دوو مرۆڤی گرتووە و ئامێزیان پێکدا کردووە و بە ســـــەر بەســـــتی هەنگویندا دەڕوانن، مریەم و حەسەنن.

لەگەڵ یەکەم بارانی پایز دەنگی حەســـــەن و مریەم دەبیستی. خاک بۆنی ئەوانی لێدێ. لە خاکەلێواندا بەستی هەنگوین ببینە، گوڵ نیە لە شــــێوەی لێوی مریەم نەپشــکوێ. هەوکەش زنەکەی ســـەرێی تاتەبەردی دیدار، کتومت زاری مریەمە. چاودە هەڵۆ زەردەکە لە رەنگ و ئازایی حەســـەنە. بڕۆ لە ســـەر تاتەبەردی دیدار دانیشـــە. چاو لە گۆماوەکەی بەردەمت ببڕە. تا بیســـــت بژمێرە، ئەوجا ســــەرهەڵبڕە. دەبینی هەڵۆ زەردەکە وا بە ســــەر ئەشکەفتی ئەوینەوە، ئەو هەڵۆیە گیانی حەسەنە.

لە خەرمانان حەسەن دەبێتە بای شەماڵ و دێی مریەم فێنک دەکاتەوە. لە بەفرانبارانیش هەر ئەوینی حەســـــەنە گەرمایی بۆ دەهێنێ. هەر شـــتێ دەســـتی حەســـــەن و مریەمی وێکەوتبێ، لە یـــادەوەریـــدا دەبریســـــکێنەوە و رەشنابنەوە.

ئەشکەفتی ئەوین تا بمێنێ، وێنە وێنە، وێنەی حەسەن و مریەم دەپارێزێ و هەمیشـــــە ئەوین دەپژێنێ. لەوێوە چاوێ بە بەســـتی هەنگویندا بگێڕە. لە ســـــەر باســـکێ

کارمامزێ دەبینی. شتێکی بە ملەوەیە، ئەوە تیلمی لە لەوەندیی مریەم و پژدێنی حەسەنە.

لە ڕۆخی بەستی هەنگوین بۆ تاوێ گوێڕادێرن، قرووسکەی سەگێ دەبیستن. ئەوە زەردەیە کە پێناوی بۆ حەسەن و مریەم دەکرد.

چاو بە هەر لایەکدا بگێڕی، تارمایی ئەسپێک دەبینی. ئەسپەکەی ماڵی حەسەنە، ئەسپی رازە، ئەسپی فریاد و نیازە. لە سەر گردی خوێنەوە، گوێت لە حیلەی دەبێ. لە بەر دەرکی سەرای شارەوە دەیبینی باڵدەگرێ.

هەوکەش هەموو ساڵێ لە دوادوایی ڕەشەمێ دەم نا دەمێ کۆترەشینکە لەبەری منارەوە قەتارە دەبەستن. بە سەر سەرا و قەلاتدا دەگەنە گۆڕستانی گەورە. لەوێ کەپرۆکە دەکەن. گۆڕستان دەخەنە بن سێبەرێکی تەنک. کۆترەکان شینی حەسەن و مریەم دەکەن. چاودەنێ لە شێوەی سینگکوتانی ژنان باڵ لێکدەدەن. گوێدەنێ، گمەگمیان چەند لە سەردوولکە دەچێ.

حەسەن و مریەم لە هەموو کاتێکدا هەن. سەر بە هەموو شوێنێکدا دەکەن. ئەوان لە خدر نەمرترن. هەر جارەی ڕەنگ و شێوەی شتێ دەگرن.

ئەوان گژلۆکن، خوناوە و خوناون، ئالەکۆکن، گلووکن. ئەوان شنەی شەماڵن، بالۆرەی کچان و نەزمی

شـــمشـــالّن، پیکی دووزەلەن، لازۆکەی ناو زەنگوڵەن، گمەگمی کۆترن، جریوەی چۆلەکەن، مامزی چاو کەژاڵن. ئەوان کەڤۆکن، شـــالوورن، رەشـــوێرەن، رەنگـاڵەن، تیتلەکناچە و تیترواسکن، قریوەی قاز و قورینگن، نێسکە و حیلەی ئەسـپ و ماینن، کەروێشـکەی جۆ و گەنمن، لە هەموو گوڵێکدا بۆنن، پەلکن، لاسکن.

حەســـەن و مریەم لایلایەی دیار لانکن. لاواندنەوە و ســـەردوولکەی ژنـانی کۆســـتکەوتوون. لەوەنـدی و دەســرۆکەی دەسـتی چۆپیکێشـن. دەنگی دەفی دەسـتی دەنگبێژ و دەروێشن.

لە پەلە هەوری کەپرەشـــینە بڕوانە، شـێوەی ئەوانی گرتووە. لە گەنم لە جۆ لە گیا بڕوانە کاتێ کەروێشـــکە دەکات، بســـک و شـــابســـکی مریەم و ردێنی حەســـەن دەبینی. ئەوان لە گزنگ و زەردەپەڕدا، لە تریفەی هەیڤ و گرشەی ئەستێرەوە خۆ پێشاندەدەن.

بە چاوی من چاو بگێڕن، حەسـەن و مریەم لە ئاوێنە و لە ناو تنۆکە رۆندک و دڵۆپە خوێن و بزەی ســەر لێو و ناو نزا و سەر بەرماڵیش دەبینن.

لە هەموو رەشـێکی قەترانی جوانی و شـیرینی مریەم دەدرەوشـــێتەوە. لە زەردیی لیمۆیش حەســـەن. لە هەر

کەوچکە هەنگوینێ، تـــامی ئەوینی مریەم و حەســــەن دەکەن.

شـــوێنپێی حەســـەن و مریەم رەشـــنابێتەوە. لە گردی خوێن دەیبیننەوە. لە ســـەر بەرد بە بەردی دەو بەســـتی هەنگوین بۆتە خەنەتیلە و لە بن تیشکی رۆژێ لە دوورڕا دەبریسکێتەوە.

مریەم و حەسـەن لە ئاسـمانێ ئەسـتێرەن. ئەسـتێرەی ســـــاوە لە گەڕان ناکەون و هەمووومان دەبینن. لە زەوی سێبەرن، سێبەری ئەویندار و ئەمەکدار و یاران.

حەســــــەن و مریەم نموونەی بوێری و پـــاکی و ئەمەکدارین. هەر کێ لە شەوێکی مانگی رێبەندانێ ئەوانی بێتە خەونێ، بێ حەفتوهەشتێ دەچێتە بەهەشتێ.

تۆ بڕۆ بگەڕێ، بە بەسـتی هەنگویندا بگەڕێ. ئێسـتاش لە ســێ پیاو، یەکیان حەســەنی ناوە. لە ســێ ژن یەکیان مریەمی ناوە. ئەوانە بزانن و نەزانن، ناوی حەســــەن و مریەمی ئەشقیا و ئەوینداریان هەڵگرتۆتەوە.

## ٨

زوو، ڕۆژ گزنگی دابوو نەدابوو، گەیشـــتیە نـاو گۆڕســـتانی گەورەی شـــار. لە نێوان ئەو دوو گۆڕە بێ نازە، بێ کێل و ناوە کە هەر ئەوەتا سیمای گۆڕیان پێوە مابوو، تاوێ دانیشـتی. ئەو دوو گۆڕەی بە خەیاڵی خۆت هەر دەبێ گۆڕی ئەوان بن. لەوێوە کەوتیە ڕێ، لە شـــار دەرچوویت، لە بن گردی خوێن ڕاوەســتایت. دابەزییت و ســـەرکەوتیت، گەیشـــتیە لای کەڵەکەبەردەکە. بۆ چەند چرکەیێ گەڕایتەوە نـاو پیری گێڕانەوە. شـــەڕە تەقەت بیست و خوێنت دی. زوو لە پیری گێڕانەوە هاتیە دەرێ. ترۆمبێلەکەت هەڵکرد و بە ئاقاری ئەشـقیادا ڕێی بەسـتی هەنگوینـت گرتە بەرێ. هەرێـت بە خۆم دابوو بەر لە چاپکردنی داستانەکە، بسـت بسـت هەموو ئەو شـوێن و ڕێوبانانە ببینیت کە پیری گێڕانەوە پیشـانیداون. لەو ڕێیە چاوت بە راســـت و چەپدا دەگێڕا، دەتویســـت ئەو ڕێیە ببینیەوە کە بەر لە ســـەد ســـاڵ دوو ئەویندارەکە پێیدا

هاتبوون. پیری گێڕانەوە بەر لە پەنجا ساڵ هێند جوان کێشابووی، رۆژگار هەرچی بکات لە دەستی نایێ رەشیبکاتەوە.

دیتنەوەی رێی ئەویندارانت بۆ دوایی هەڵگرت. ئێستا پەلەتە و دەبێ زوو بگەیتە ئەوێ. لە نزیک بەستی هەنگوین رێت گۆڕی، دەستی راستت گرت، ئەو رێیە رێک دەچێتەوە دێی مریەم.

ئەو رێیە قیرە، وێدەچێ ئەوەش رێی سەربازی بووبێ، جا رێیەکانی دەچنەوە بەستی هەنگوین کامیان رێی سەربازی نیە! ئەو رێیەش تا درەنگ رێی کەر و بار بووە. بەر لە سەدەیێ وێدەچێ پیری گێڕانەوە بێرەدا لە دێی مریەمەوە بە پێیان هاتبێتە هەنگەوان و لەوێوە بە ئەسپەشێوە گەڕابێتەوە. ئەو ئەسپەی هەستدەکەیت ئێستاش لە تەپۆلکە و کەپکە شاخ و سەر باسک و زوورگان، لە ناو کەند و دۆڵەکانەوە حیلەی دێ و لە سەرت دەنگدەداتەوە و نایبڕێتەوە.

هەوە، ئێرە ئاوایی ناو داستانەکەیە، ئاوایی مریەم. زۆر گۆڕاوە، خانووبەرەکان سیمای هەینێیان نەماوە، بەڵام تۆ بە هۆی بەستەکە و هەندێ کەپکە شاخ و تیشەبەرد و کانیەوە، باش شوێنیماڵەکان دەناسیەوە.

ماڵی مریەم، کوڕە ئەشــقیا، کوشــتەی مریەم، کوشــتەی لیرە، ماڵی پیری گێڕانەوەش.

بە ئاواییدا گەڕایت. چەند کەســـێکی بەتەمەنت دواند، بەڵام لە بارەی داســتانەکەوە، لە زاری کەســەوە شــتێکی وات هەڵنەکڕانـد. شـــتێکی کەمیـان لە بـارەوە دەزانی، دیاربوو داســـتانەکە لە ســـەر لەبیرچوونەوەیە، یان لە بیرخۆبردنەوەیە. لە هەندێ چاو وات خوێندەوە، نایانەوێ باســـی بکەن. درەنگ پێکەوتی گەورەی ئاوایی لە نەوەی کوشـــتەی لیرەیە. کەســـت لە نەوەی پیری گێڕانەوە و کوشتەی مریەم نەدیتەوە.

بەر لەوەی بە ڕێی هێلانەی هەڵۆدا هەڵکشــێیت، ژنێک کە لە دەو بەســـتێ لەگژ خڕکردنەوەی چیلکەوچواڵ بوو، لێی پرسیت:

+ برا، دەڵێی لایدەی، بە دوای چیدا دەگەڕێی؟

– بە شــوێنپێی دوو ئەویندارەدا کە ســـەد ســـاڵ بەرێ، بێرەدا، بە ناو بەفردا سەری خۆیان هەڵگرت.

+ سەد ساڵ! مەبەستت حەسەن و مریەم نەبێ؟

– بەڵێ.

+ وا دیـارە خودا لێی گۆڕیوی، ئەوان هێســـــک و پرووسکیشیان نەماوە، شوێنپێ!

- لەوە گەڕێ، تۆ هیچ لە بارەیانەوە دەزانی؟

+ کەم هێندە دەزانم ئەوان مەم و زینی ئەو ئاقارە بوونە، بەڵام لە بەکرۆکەیەک زیاتریان هەبووە.

- هەر هێندە؟

+ ئەوەش دەزانم برایەکی باپیرم بۆ ئەو مریەمە بە کێوان کەوتبوو لە سەر زاران بە کوشتەی مریەم ناوی رۆیشتبوو.

- چیدی؟

+ بڵێم چی، ئەگەر بتەوێ لە بارەیانەوە شتێ بزانی، ئەوان کەوتوونەتە ناو لاوک و حەیرانەوە...

- گوێت لەو لاوک و حەیرانانە بووە؟

+ بەڵێ، بەڵام بە دڵم نین.

- لۆ؟

+ سەربردەکە شێوێنراوە، لە هیچیان ناوی کوشتەی مریەم نەهاتووە.

- ئەها، ئەدی ئەگەر بزانی، ئەو گوندە ناوی مریەم نەبوو؟

+ با، سەردەمێ ناوی مریەم بووە، بەڵام دوایی گەورەی ئاوایی ناوەکەی گۆڕیوە. ئێستا کەس بە مریەم ناوی ناهێنێ.

- رەنگبێ ناوی بەستەکەشی گۆڕیبێ.

+ نا، لە سەری سەرەوە تا لە زێ دەکاتەوە، هەر بە هەنگوین ماوەتەوە.

- تۆ لەبیرتە ئەو بەستە هەنگوینی زۆر بووبێت؟

+ نا، بەڵام لە دایکمەوە بیستوومە، بەست سەراپا هەنگ بووە. خەڵکی هەردوو بەر بە بار هەنگوینیان کێشاوەتەوە و بۆ شاریان ناردووە.

- ئێ، تۆ بڵێی برای باپیرت یەکێک لە بەکرۆکەکان نەبووبێ؟

+ شتی وام نەبیستووە، ئەها گۆڕەکەشی لەو گۆڕستانە کۆنەی سەرێ، گۆڕستانەکەش هەر بە ناوی ئەوەوەیە. پەڕۆکێکی کەسک بە کێلی گۆڕەکەیەوە، پێشان ئەو کەسانەی تووشی دەردی ئەوینی لە شێوەی وی دەبوون، دەچوونە سەری.

بەر لەوەی ملی رێ بگریت، چەند پەڕێکی پیری گێڕانەوەت هەڵدایەوە. ئەو پەڕانەی بە خوێندنەوەی، سەرما بە شێوەێ تینت بۆ دەهێنێ، بە ئاگری دۆزەخیش

گەرم نـــابیتەوە. ئەو گێڕانەوەیەی لە خوێنـدنەوەی تێر نـابیـت و نـابیـت. بە تۆ بـا درێژ بـا، لە هەزار و یەک شـــەوەش درێژتر، هێند درێژ نیو تەمەنی ویســـتبا بۆ خوێندنەوە، بۆ گێڕانەوە.

## ٩

لەو شەوە بەفراویە، لەو شەوە تووشە، وەک خودا لە دڵی نابم کە کەسێ لێی دەقەومێ و پێویستی بە من دەبێ. لە ژوورێ و بە دیار ئاگرەوە خۆم نەدەگرت، پێیەکم هەر لە دەرێ بوو. گوێم بە سەرما نەدەدا، بە کۆڵانی بەفردا سەرێ و خوارێی ئاواییم دەکرد. خەیاڵم لای کوڕە ئەشقیا بوو. دەبێ لە کوێ لە ناو بەفر رەقبووبێتەوە، داخوا رووی لە ئاواییەک کردووە و ماڵێک پەنایان داوە؟ ئاخر ئەو هەموو دەرگاکانی لە سەر داخراوە. کێ دەوێری بۆ شەوێکیش رایبگرێ. لەشکرێ بە دوایەوەیە، سەری وی سەر بە سەر لیرە دەکات.

دیتم کوشتەی مریەم لە ماڵێ هاتە دەرێ و بەرەو ماڵی کوشتەی لیرە چوو. دڵم تریواندی. بە پێدزە بە دوایدا چووم. لە پشت دەرگا خۆم لێگرتن. گوێم لێیە، کوشتەی لیرە دەڵێتە کوشتەی مریەم:

لە چاکەت دەرناچم. ئەگەر راست بێ، دەست لە سەر چی دادەنێی، بۆ خۆت بێ.

کوشتەی مریەم:

بە چاوی خۆم دیتم خۆی بەماڵێدا کرد.

کوشتەی لیرە:

کاری تۆ تەواو، بۆ منی لێگەڕێ. بەرەبەیان لە شیرنەی خەودا لە خوێنی خۆی دەگەوزێ.

کوشتەی مریەم:

مریەم بۆ من و لیرە بۆ تۆ.

کوشتەی لیرە:

لە لیرەکەش بەشت دەدەم.

کوشتەی مریەم:

من دەڕۆم، مریەمم بەسە.

یەکێ خۆم گەیاندە ماڵی مریەم. نزیک بوو، کەوتبووە نێوان ماڵی ئێمە و ماڵی کوڕە ئەشقیا. دیاربوو هێشتا بە هاتنەوەی وی نەزانیبوو. پلان و نەخشـــەی کوشـــتەی لیرەم بۆ باس کرد، بەڵام نازانم بۆچی ناوی کوشـــتەی مریەمم نەهێنا!

کوڕە ئەشـــقیا دوو ســـاڵێ لە ئێمە گەورەتر بوو. کوڕێکی کەڵەگەتی چوارشـــانە، زۆر بەهێز بوو، بـاری

هێستریکی هەڵدەگرت. بوێر بوو، شەڕی لەشکرێکی دەکرد. سەرەتا ویستی بمێنێتەوە و بە سەریان دادا و شەڕبکات. منیش لەگەڵ شەڕکردن بووم. هەرچەندە چەکیشم نەبوو. چەکی من گرێنییێ بوو. گرێنیش شەڕی تفەنگی پێناکرێ، بەڵام ئامادەبووم، خۆم بکەمە چەپەر و سەنگەری کوڕە ئەشقیا. بە هەر جۆرێ بێ یاری بدەم. لە ئاوایی هەشت نۆ دە تفەنگچیی نەیاری کوڕە ئەشقیا هەبوون. کوڕە ئەشقیا پەژیوانبووەوە، گوتی:

+ رەنگبێ خەڵکێکی زۆر تیابچن، سەرهەڵگرتن لە شەڕ باشترە. نابێت لێرە شەڕ بکەم و ئەو هەرێیەی بە بابمم دابوو، بیشکێنم.

- چ هەرێیەک؟

+ وەبیرمدێ منداڵبووم، بابم گوتی: کوڕم، هەرێم پێبدە، دنیایە رۆژێ وەک من تفەنگی ئەشقیاییت کردە شان، هەرگیز نەکەی شەڕ بهێنیە ناو ئاوایی.

هەرێم پێدا و سوێندم بە تفەنگەکەی خوارد، شەڕ نەهێنمە ناو ئاواییەوە.

گوتم:

کەواتە وەها دەتشارمەوە، سەگی ئینگلیزیش نەتبینێتەوە.

کوشـــتەی لیرە ســـەگێکی پەیـداکردبوو. گۆیە لە ئینگلیزەکان وەریگرتبوو. مرۆڤ لە بن بەژنێک بەفریش با، بە بۆن دەیدیتەوە.

کوڕە ئەشقیا بە پێکەنینەوە:

دەتەوێ بمخەیتە بن ئەســـتێرک و نـاو کەنـدووەوە، بمبیننەوە و ئابڕووم بتکێ.

ملینەدا، ئەوە بوو سەری خۆیان هەڵگرت.

لە سەر رۆیشتنێ گوتم:

چ جێ نیە بۆی بچن، دڵنیام بەفر دەبێتە گۆڕتان.

مریەم گوتی:

بەفر لەوانە بە بەزەییترە، بۆ ئێمە گەرم دادێ.

حەسەن گوتی:

خەمی ئێمەت نەبێ، پەنایەکی گەرم دەبینینەوە.

گوتم:

لەو سەهۆڵبەندانە کوا پەنای گەرم؟

گوتی:

ئەوین بێ پەنای گەرم نابێ.

سەرم خستە بن گوێی و گوتم:

ناڵێی دەچنە کوێ؟

گوتی:

تا نەکەومە رێ، نازانم بۆ کوێ. تۆ وریابە، چاودێری بکە، کەس نەمانبینێ.

من لای خۆمەوە چەندی سەرم هێناو برد، لەو سەهۆڵبەندانە چ پەنایەکی گەرمم شک نەبرد.

لەو ساتە بەفر بە گوڕ دایکرد، چاو چاوی نەدەبینی. نەمدیتن کیهە لایان گرت.

ئەو شەوە بە شەوی حەسەن و مریەم کەوتە دیرۆکی بەستی هەنگوینەوە. شەوێ بوو، شەوی برایمی مەلازێندینان لە چاو ئەو شەوە شەوێ بوو لە شەوانی جۆزەردانێ. تا درەنگیش هەر کەسێ لەو شەوەدا مردبا، خەڵک دەیانگوت:

خۆزگەم بە خۆی، بە پێڵاوەوە چووە بەهەشت.

ئەوان بەفر بردنی و کوشتەی مریەم مریەم و کوشتەی لیرە کیسەی لیرەی لەدەستچوو.

رۆیشتن و من دڵم لە هەزار لێیدەدا. نزام دەخوێند کەس نەیبینین. لە ناو جێ تۆتکەم نەدەگرت. پێیەکم

لەدەرێ پێیەکم لە ژۆرێ. هێشـــتا مابووی بۆ نوێژ، بەفر لێیکردبۆووە. لەو شەوە زەوی سپی سپی لە رەنگی ددانی مریەم. دەبینم شـەش حەفت تفەنگچی بە سـەر بەفردا، بە ناو بەفردا بەرەو ماڵی کوڕە ئەشـــقیا دەچن. دوای تاوێ بووە هەرا. گوێم لێیە دایکی کوڕە ئەشـقیا کە بە ئاسـتەم دەنگی دەردێ:

کوڕە شـــەرمتان بە خۆتان نیە، بەو شـــەوە بە ســـەر پیرێژنێکـدا دادەن، ئێوە خەونتـان دیوە؟ کوڕی من خوا دەزانێ ئێســـتـا لە کوێ رەقهەڵاتووە، بۆتە پـارووی چ دەعبایێ، چ دەکات لێرە!

لەوێوە بە ســـــەر ماڵی مریەمیان دادا. ئاوایی وەئاگا هاتن و خڕبوونەوە. کوشتەی لیرە دەڵێتە بابی مریەم:

بە من بڵێ کچە بەدووکەوتووەکەت لەکوێیە؟

بابی مریەم بە تووڕەیی و دەنگی نووســاوەوە باگۆی دەداتەوە:

هەی ناکەس، کچێ ئەگەر بەدووبکەوێ، پرس بە بابی دەکات دەچێتە کوێ؟

کوشـتەی لیرە لوولەی تفەنگ دەخاتە سـەر سـینگی و ددانی جیرِدەکاتەوە:

– نەیلێی، بە قوربانی یەک فیشەکت دەکەم.

+ ئەگەر نەیتەقێنی، هێندەی سەرە دەرزیەک پیاوەتیت تێدا نیە.

چەند کەسێ دەستی دەگرن و دووریدەخەنەوە.

بابی مریەم دەڵێ:

مەڕۆ پێتدەڵێم. تۆ زۆر درەنگ هاتی. کچە رووسوورەکەم بەر لە سێ شەو، سەر بەرزانە، بۆ لای دەزگیرانی خۆی چوو. ئەگەر پیاوی بڕۆ بیانبینەوە.

وەک بڵێی قسەیەکی باشی نەکردبێ، گوتی:

راوەستە نەزان. چەند رۆژ دەبێ کچەکەمت نەدیوە؟ ئەوم بەر لە بەفرەکە ناردە شار، نەخۆش بوو، وا لای دختۆرە.

بە شێوەیەک ئەو قسەیەی کرد، هێندەی نەمابوو منیش باوەڕی پێبکەم.

*ئای من کەسێکی چەند بوودەڵە و نابوود بووم، چەند هیچ لە بار و نەوێرۆک بووم. ئەگەر هێندەی مشکێ زاخم تێدا با، دەبوو ئەو دەمە هەڵکوتمە سەر کوشتەی لیرە و لە خوێنی بگەوزێنم.*

لەو کاتە بەفر تێیکردەوە. کوشتەی لیرە ماڵ ماڵ گەڕا. ناو گەور و کادین گەڕا، ئەستێرکی هەڵدەدایەوە و سەری بە ناو کەندوو دادەگرت، ژنێک لێی راستبۆوە:

هێی کابرا، حەســـەن ئەو پیاوەیە خۆی لە ناو ژن و منداڵان بشـــارێتەوە! ئەگەر تۆزێ زاخت تێدایە، برۆ لەو کێوانە لە دوای بگەڕێ.

تێگەیی لە ئاوایی نەماون، ئیدی...

کوشتەی لیرە لەو بەرەبەیانەوە تا ئێوارە داهاتەوە، بە ناو بەفرا بە دەوری ئاواییدا دەگەڕا. ناوە ناوە فیشەکێکی دەتەقاند. رۆژی دوایی نەخۆش کەوت و لە جێ کەوت. تا بەفر نەتوایەوە، هەڵنەستایەوە.

ئەو رۆژە هەڵمکوتایە ســـەر کوشـــتەی مریەم. هاتە ســـەرم بەر خەنجەرانی بـدەم، بەڵام من کوا پیـاوی پیـاوکوشـــتنم. لەو کـاتەوە تـا هەوکەش خەنجەری بەر پژدێنم بە نیازی راوەشانێ نەهاتۆتە دەرێ لە کالانێ. من لە نەکوشتنی یەک کەس پەژیوانم، نازانم نە لە ترسنۆکیی خۆمەوە بوو، نە لە ترســی خودای خۆم نەمکوشــت. ئەو کاتەی کوشـــتەی لیرە لە جێ کەوتبوو، دەرفەتێکی باش بوو هەڵکوتمە ســـەری و لە خوێنی بگەوزێنم. دەســـتی شکاوم، لەدەستمچوو.

کوشتەی مریەم دوایوەی زانی مریەمیش رۆیشتووە، دەستی خۆی دەشکاندەوە، بە چەپەڵۆکان لە سەری خۆی دەدا، شانیم راتەکاند و گوتم:

ناپیاو، تۆ چیت کرد؟ هەموو ئاواییت تێدەگەیەنم.

گوتی:

پەژیوانم، لێرە تا ئاسمان پەژیوانم، داری تۆ و پشتی من، لێمدە، بمکوژە، ئیدی کەڵکی ژیانم پێوە نەماوە.

ئەو ماوەیە سەرم لێیان نەبڕی. پێیەکم لە نک بابی مریەم، پێیەکم لە نک دایکی حەسەن، دڵم دەدانەوە، بابی مریەم ناوە ناوە دەیگۆ:

خەمی مریەمم نیە، دەزانم حەسەن چ خۆشمێر و مێرخاسێکە، دەرۆستی بەفر و زریان دێ. خستبێتیە ناو باخەڵیەوە کچەکەم دەپارێزێ و پەنایەکی گەرمی بۆ دەبینێتەوە.

دایکی حەسەن وردە رۆندکانی دادەباراند:

حەسەنەکەم چەند جارێ شەو درەنگان دەهاتەوە. شەوی دوایی بەر لەوەی دنیا رووناکی تێکەوێ بە کێو دەکەوتەوە. کەسیش هەستی پێنەدەکرد. نازانم ئەو جارە بەو بەفر و زریانە چ خواگیرێ دیتی، سەرم لەوە دەرناچێ.

پرسیم:

- هەموو جارێ مریەمیشی دەدی؟

+ بێ دیتنی مریەم چۆن رێی دادەگرت؟ هەر من دەزانم چەندێ یەکتریان خۆشدەوێ. خودایە، خودای لە سەر سەران، بیانپارێزە. کەسیان هیچیان بەسەر نەیەت، چوونکێ دەزانم بە بێ یەکتر رۆژێک ناژین.

من پێشتریێ زانیبووم، حەسەن سەردەداتەوە. دوو جاریش دیتبووم، بەڵام وا دیارە زۆر جار هاتۆتەوە و من هەستم پێنەکردووە.

## ١٠

دەو بەست دەو بەست هەڵکشایت. گەیشتیە راستی گۆڕستانی کوشتەی مریەم، کەوتبووە سەر گردۆلکەیێ. سەرکەوتیت و بە دیار کێلی سەری کوشتەی مریەمەوە:

های، سەیدۆکەی شێت و شوور، رێی ئەو داستانەت بە کوێدا برد!

هاتیەوە سەر رێ و رووە و هێلانەی هەڵۆ پێت هەڵێنا. هەڵۆیەکی زەردت بە ئاسمانەوە دی، رێک هەڵۆی ناو پیری گێڕانەوە بوو. ئەو هەڵۆیە بوو کە لە ناو گۆماوەکەوە هاتە دەرێ و لە ئەشکەفتەکەوە خۆی پیشاندایەوە. بیرتکەوتەوە، هەڵۆ ئەگەر دەندووکیشی نوێ بکاتەوە، هەر حەفتا ساڵێ دەژی، لە بەر خۆتەوە:

هەر دەبێ لە نەوەی هەڵۆی ناو داستانەکە بێ.

چەند دێرێکی داستانەکەت بیرکەوتەوە، پیری گێڕانەوە گوتبووی:

*((هەڵۆکە پێدەچوو تەمەنی منی هەبێ، وەبیرم دێتەوە لە تەمەنی پەنجاساڵی، چەند کەڕەتێ لە نزیکەوە دەمدی، دەهات بە هەموو هێزی خۆی، دەندووکی کولی لە تاشەبەردان دەدا، دیاربوو هێزی پچڕینی گۆشتی نەمابوو. توند لە بەردی دەدا، تا وای لێهات دەندووکی پێوە نەمابوو، دوای ماوەیێ دەندووکی هاتەوە. دەندووکێ لە جاران تیژتر. بەوە بیست ساڵێ تەمەنی خۆی درێژ کردەوە. خۆزیم دەخواست ددانی منیش لە شێوەی دەندووکی ئەو بان.))*

بە کوێرەڕێدا بە ناو پووش و پەڵاشدا هەڵکشایت. ئەو ڕێیەی لە شەوی هەڵاتنی کوڕە ئەشقیا و یارەکەی نیو بەژنێ بەفری تێکردبوو. بە هەموو لایەکیشدا چاوت دەگێڕا. لەو کەپکەشاخ و گابەردانە ورددەبوویتەوە کە هەریەکیان شێوەی گیانلەبەرێکی وەرگرتبوو. هەبوو شێوەی سەرە شێر، سەرە ئەسپ، کەڵەباب، مرۆڤی لە سەر چیچکان دانیشتوو.

چاوت کەوتە سەر کەپکە شاخێ، کە لە سەر سۆرکێکی خەنەیی قیت ڕاوەستابوو، ڕێک لە دوو مرۆڤ دەچوون ئامێزیان بە یەکتردا کردبێ. هەستتکرد ئەوە حەسەن و مریەمن. لە ڕێی خۆت لاتدا و بەرەو وان هەڵگەڕایت. بینیت ڕێ سەختە و بە زەحمەت دەگەیتێ. گەڕایتەوە و کەوتیەوە ڕێ.

ڕێ درێژە و کاتیش درەنگە، تا دەگەیتێ و دەگەڕێیتەوە دێی مریەم، شەوت بە سەردا دێ. بە نابەدڵی گەڕایتەوە. لە گەڕانەوە، لە دەو بەستێ، لە نزیک هەندێ بنە تووتڕک، پوورەی هەنگت بینی. تۆ بڵێی وەچەی ئەو هەنگانە بن کە بەستی هەنگوینیان بە ناوەوە کراوە، یان ئەوان وەچەیان بڕابێتەوە و ئەوانە لە ئاقارێکی دوورەوە ڕێیان بێرە کەوتبێ. کەمێ لیان وردبوویتەوە، لە بن لێوانەوە گوتت:

نا، ئەو هەنگانە هەنگی ناو داستانەکە نین.

لە نزیک ئاوایی سەگێکی زەردت دی. کلکی پێشوازیی بۆت ڕادەوەشاند. تۆ بڵێی ئەوە لە وەچەی زەردەی تەتەر و پێناوەکە نەبێ!

پێت هەڵینا، گەیشتیەوە دێی مریەم. بەر لەوەی سواری ترومبێل بیت، ژنەکە دەرکەوتەوە و پرسی:

ها برا، شوێنپێیانت دیتەوە؟

باگۆتدایەوە:

بەڵێ، شوێنپێی ئەوان بە سەر بەرد و دارەوە، بە سەر خۆڵ و ئاوەوە دیارە. ئەوانیشـــم دیتەوە، لە ســـەر ئەو باسکەی سەرەوە قیت ڕاوەستاون.

ژنە بە پێکەنینەوە:

+ ئەو بەردەی لە شێوەی مرۆڤە...

- ئا، کتومت ئەوانن.

+ کاکی برا، واز لەو خەیاڵە بێنە، با تۆش نەبیتە بەرد. تۆ سەربردەی ئەو بەردە مرۆڤانە دەزانی؟

- هێندە دەزانم حەسەن و مریەمن.

+ نا، من لە نەنکمەوە بیستوومە، ئەویش لە نەنکیەوە گوایە کاتێ ئایینی ئیسلام دەگاتە ئەو بەستە، ئەو ژن و پیاوە باوەڕی پێناهێنن. خوداش هەڵیاندەداتە سەر ئەو باسکە و دەیانکاتە بەرد.

- تۆ باوەڕت بەوە هەیە؟

+ بڵێم چی، خودا هەموو شتی لەدەستدێ. بەڵام بزانە، حەسەن و مریەم هێشتا لە چ جێ دیار نەبوون، ئەو بەردە بەو شێوەیە لەوێ بووە.

- باشە، نەنکت سەربردەی ئەو بەردەی وا بە وردی دەزانی، تۆ بڵێی سەربردەی حەسەن و مریەمیشی نەزانیبێ و بۆتی نەگێڕابێتەوە؟

+ رەنگبێ سەربردەی ئەوانیشی گێڕابێتەوە، بەڵام من لەبیرم نەماوە.

لە بن لێوانەوە گوتت:

وایە، سەربردەی بەرد لەبیرناچێتەوە، بەڵام هی مرۆڤ ئاوە و ئاو دەچێ.

ژنە گوتی:

+ چیت گوت؟

باست گۆڕی و پرسیت:

دەڵێم داخوا نەنکت سەربردەی سەگەکەی بۆ نەگێڕاویەتیەوە؟

ژنە بە سەرسوڕمانەوە:

سەگی چی، کام سەگ؟

گوتت:

ئەو سەگەی پێناوی بۆ حەسەن و مریەم دەکرد. چۆن دەبێ خەڵکی ئێرە بیت و سەربردەی ئەو سەگەت نەبیستبێ؟

ژنە تەواوێ تێت راما:

برا، درەنگت بە سەر دادێ، زوو بگەوە ماڵێ.

گوتت:

باشە دەڕۆم، یەک پرسیاری دی:

نەنکت باسی ئەو گابەردە بەردەبازانەی خوارێی بۆ نەکردووی؟

گوتی:

با، ساڵێک لافاوێکی بێ ئامان هەستاوە. لە بەفرانبارانەوە تا جۆزەردان نەنیشتۆتەوە. شەیتانیش لەو سەرەوە حریت حریت بە ئاوایی پێکەنیوە و گوتوویەتی:

هێندە لە خۆڕا منتان بە نەفرەت کرد، ببینن خۆدا چۆن تۆڵەی منتان لێدەکاتەوە، ڕێی پەڕینەوەی لێگرتوون.

خودا زگی بەو خەڵکە سووتاوە. بۆ دەمکوتکردنی شەیتانیش، گازیکردووە و فەرمانی پێکردووە:

بچێ لەو کێوانە حەفت گابەرد لە خۆی باربکات و بیانهێنێتە ئێرە و بەڕیز دایانبنێ و بەردەباز بۆ ئاوایی چێبکات.

نابینی ئەو حەفت بەردە تا ئێستاش لە شوێنی خۆیانن. هەزار لافاو هەستا و نیشتەوە، وەک چیا چەقیون و نەلەقیون.

بە پێکەنینەوە گوتت:

- شەیتان وەستاکاری لە شتێک بکات، بە هیچ هێزی تێکناچێت.

+ برا، بە شەیتاندا هەڵمەڵێ، خودا لە دڵی گران دەبێ.

– ئەدی ئەو پردە کۆنە رووخاوە دەستکردی کێ بوو؟

+ هەر دەبێ ئاوایی هەڵیاننابێ.

– بیستوومە دەستکردی بابی مریەمە.

+ تۆ ســـەری هەموو قســـەیێ دەبەیتەوە لای مریەم. بۆ ناڵێی هەر لەبەر خاتری مریەمیش درووستیکردووە تا بە ئاسانی بە سەریدا بپەڕێتەوە؟

– نـــازانم، دوورنیە، واز لەوە بهێنە، نـــازانی لە کەیەوە رووخاوە؟

+ با، بیرمە، فڕۆکەی عارەبان بۆردومانی کرد، کەســـیش چاکینەکردەوە.

– یەک پرسیارم ماوە، چیدی سەرت نایەشێنم. لەو گوندە چەند کەس هەن ناویان حەسەن، مریەم بێ؟

بە پێکەنینەوە:

چیە دەتەوێ لێکـدیـان مـارە بکەیـت؟ کـاکە، شـــەش حەسەنمان هەیە، مریەمیش بە منەوە دەبنە حەفت.

مـاڵاواییـت لە مریەمی ئـاوایی مریەم کرد. گەڕایتەوە و پیری گێڕانەوەت کردەوە.

## ١١

بەســـــتی هەنگوین ســــەرتاپا هەنگ و هەنگوین بوو. هەردوو بەر، لە کانیاوەکانی ســـەری ســـەریۆوە تا لە زێی دەکردەوە، هەنگ و هەنگوین بوو. هەرچی هەنگی جوانی دنیا هەیە رژابوونە ئەو بەستە. نا، وێدەچێ لێرەوە هەنگ بە دنیـادا بڵاوبووبێتەوە. لە وەرزی گەڕانـدا مینـا پەلە هەوری تەنکی بەر زەردەپەڕ بە سەر بەستا هەڵدەکشان و دادەکشـــان. هەنگی رەش و زەرد، ســـوور و ســـپی، چ رەنگت دەویســـت هەبوو. بەڵام رەشـاییان لە رەنگەکانی دی جوانتر دەبریســـکانەوە، دەتگۆت درەوشـــانەوەیان لە گۆنای مریەمەوە وەرگرتووە. هەنگی بەستی هەنگوین، لە رۆژێکدا ئەم سەر و ئەو سەری بەستیان دەکرد. بە سەر باسک و تەپۆلکە و شاخەکاندا هەڵدەفڕین. با ماندوو بایە، زێ مـانـدوو بـایە، ئەوان مـانـدوو نەدەبوون. دەتگوت ماندوونەبوونیان لە پێی کوڕە ئەشقیاکە خواستووە. گوڵ و گوڵاڵەیێ نەدەما لە ســـەری نەنیشـــنەوە، جێ نەمابوو تۆوی گوڵی بۆ نەگوازنەوە. لە بەهاراندا، ئەو دەشـــت و

دەرە سـەراپا دەبووە گوڵزاری هەزار تەرز و رەنگ. گوڵاڵەی پەلک رەش لە هەمووان جوانتر خۆی دەنواند، رێک لە وێنەی لێوی کەمێ گۆشتنی مریەم.

لە کونە شاخ و سـەر بەرد و ناو کۆلکەدار و هەموو پەناوپەسـیوێکەوە هەنگوینی رەش، سـپی.. دەرژایە ناو بەست. بەست شـانە شـانە هەنگوین، لە وەرزی پایز و هاوین، ئاوی بەسـت تامی هەنگوینی دەگرت. رووباری بەهەشـتیش هێندە هەنگوینەی نەرژاوەتێ. چ هەنگوینێ! وێنەی پێکەنینی مریەم شـیرین. دوایوەی جوانیی مریەم دەنگیـدایەوە، هەنگوینی رەش بە هەرمێن بوو. کەس بە لای هەنگوینی سپیدا نەدەچوو.

وەبیرمـدێ، لە بەرزایی پشـت تـاتەبەردی دیـدار، تەختەبەردێ هەبوو. ئەگەر لە بەری هێلانەی هەڵۆوە لە دووربینەوە ورد لێت روانیبا، شـێوەی سـینەی ژنی دەدا بە دوو مەمکی قیتەوە. حەسەن گۆتبوویە مریەم:

لە سەیرکردنی ئەو بەردە تۆ دەبینم.

لە سـەر ئەو بەردە سـینەیە دوو بسـتێ لە سـەرێی مەمکەکانی، زنەیەکی کچکە هەبوو. شـێوەی لە زاری مریەم دەچوو. وێدەچوو سەرچاوەکەی شـانەی هەنگوین بێ. گەزێ سـەرتر بنجە شیواشینکێ هەبوو، لە دوورەوە لە فۆتەی سـەری مریەم دەچوو. لە زنەوە بە نێوان هەرد

و بەردە قیتەکە جۆگەلەیەکی باریکی پێچاوپێچی بە نازەوە دەڕۆیی و لە نزیک تاتەبەردەکە لە بەستی دەکردەوە. دەتگۆ رۆیینی منداڵیی مریەمە. هەر کەسێ گۆلمێکی لێ خواردبایەتەوە، لە بنی دنیاش با، بۆی دەگەڕایەوە. دەو ئەو جۆگەلەیە هەنگی لێ نەدەبڕا.

خەڵکی ئاقاری بەستی هەنگوین لە سەر هەنگوین دەژیان. تا ساڵی بەفرە ئەستوورەکە و لافاوی دووەمی نووح بۆ بژێوی هەنگوینیان بەس بوو. بە بار بۆ شاریان دەبرد و بە بارێ شتەوە دەگەڕانەوە. لە ساڵی گرانی گەڕێ کە لابارێ هەنگوین، دوو مستە گەنمی نەدەکرد، دەنا هەنگوین بە نرخ بوو. هەموو شتی پێدەهات. تاقە کەسێ کەڵکی لەو بەخششەی بەستی هەنگوین وەرنەگرتبێ، کوشتەی لیرە بوو. ئەو پیاوە بە ژن و منداڵەوە هەنگوینیان لێنەدەکەوت. سەرە پەنجەیەکیان دەگەیاندە زاریان، رۆژێ لە جێ دەکەوتن. هێ لە هەندێ فرۆشتنیشی لێنەدەکەوت. چەند جارێ تاقیکردبۆوە، بۆ شاری بردبوو، هەر جارەی تووشی بەڵایەکی گەورە بووبوو. لە سەر هەندێ وازی لێهێنا و ببڕاییبڕ بە لایدا نەچۆوە.

حەیف، دواتر کە ئاگری شەڕ دنیای داگرت، بەستی هەنگوین هەڵپڕووکا، بووە سووتماک. هەنگ و هەنگوین و ئاژەڵ و باڵدار و بێباڵ هەڵقرچان و بوونە خۆڵەمێش.

زۆری ویست تا لێره و لەوێ تاکوتووک پەیدابوونەوه و
کەمێ ژیانیان به بەستی هەنگوین بەخشیەوه. زەوی
هێنده گەرمایی هەڵمژیبوو، بەفر چەندێ دەکەوت، هێنده
نەدەمایەوه.

## ١٢

خواخوات بوو، زوو ڕۆژ ببێتەوە، تا سەرێ لە بەردە سینە و زنەی لە زار چوو بدەیت. نوێژیان کەوتیە ڕێ. تاو کەوتبوو گەیشتیە ڕاستی ئەو گوندەی بەر لەوەی بگەنە گردی خوێن، پەنای حەسەن و مریەمی دابوو. پێچێکت بە ئاواییدا کرد، سەر و دڵت گیرا. گەڕایتەوە و هاتیتەوە سەر ڕێی خۆت.

ئێستا لە شێوەی سمۆرە بە بەرزاییەکەدا هەڵدەگەڕێیت. بەردەکەت دیتەوە. دەبێ هەو بێ. خۆڵ و گژگژەی سەریت لادا. هەوە، بە مەمکەکانی ناسیتەوە. بەردێک دەڵێی لە تەمەنی خۆی دڵۆپە ئاوێکی وێ نەکەوتووە. نە زنە ماوە نە شوێنەواری. بە خەیاڵی زنەی ناو داستانێ، سەری دەبەی ئاوەکەت کردەوە. ڕژاندتە نێوان مەمکانەوە.

ڕۆژ وا بە سەر دوندی هێلانەی هەڵۆوە، باڵداری لە تیشکی ڕۆژ خێراتر بەرە و بەست لە باڵ دەدات. دووربینەکەت لە چاو کرد. ناسیتەوە. هەڵۆ زەردەکەی

دوێنێ بوو، دیتت پڕی دایە ســـــووســـــکەیێ و وەکات گەیشتەوە دوندەکە.

هاتیەوە سەر تاتەبەردی دیدار. لەگژ بوویت تا بیست بژمێریت و هەڵۆی ناو داستان ببینیتەوە، سڵاوی شوانێ لە دیتنی کردیت. کەوتنە باسوخواس:

– کاکی شوان، چەند پشت دەبێ لەو بەستەن؟

+ بڵێم چەند، لە سەردەمی ئادەم و حەواوە.

– تۆ دەگەیتە ئەو هێلانەی هەڵۆیە؟

+ هێلانەی سەر ئەشکەفتی گاوران دەڵێی؟

– بەڵێ.

+ دەگەمێ، بەڵام ناچم، کەس ناچێ، تۆش نەچی.

– بۆچی؟

+ ئەوەی بچێ، زۆر ناژی.

– بە چی دەزانی؟

+ هەموو خەڵک وا دەڵێن.

– کەس چووە و زوو مردبێ؟

+ من لە بیرم نیە، بەڵام پیرەکان دیویانە و دەگێڕنەوە. ناوی زۆر کەس دەڵێن، لەبیرم نەماون. حەسەن و مریەمێک هەبوونە، چەند شەو و رۆژێک لەوێ ماونەتەوە. کە هاتوونەتە خوارێ، زۆری نەبردووە مردوونە.

- تۆ چی لە بارەی ئەوانەوە دەزانی؟

+ دەڵێن ئەشقیا و ئاشق بوونە.

- چیدی؟

+ دەڵێن ئەو زستانەی لەوێ ماونەتەوە، بەفر بەژنێک کەوتووە. بەست بە شێوەیەک بەستوویەتی، کەر و بار بە سەریدا پەڕیونەتەوە و شەختە نەشکاوە. لاوکبێژیش حەسەن و مریەمیان کردۆتە لاوک، هەر هێندە دەزانم.

- هەر هێندە؟

شوانە کەمێ بیریکردەوە:

+ ئا، باپیرم کە بە بنەچە هی ئەو گوندەی خوارێ بووە، تا مردیش هەر بە مریەم ناوی دەهێنا. زۆری لە بارەیانەوە دەزانی. خۆیشی هاوڕێی حەسەن بووە. سەربردەی ئەوانی ورد و باریک دەزانی. باپیرم هەقایەتخوانێ بووە، وێنەی نەبووە. بەڵام من کەمم لێی بیستووە، چوونکێ ئەو لە شار دادەنیشت. چەند جارێکم دیوە. بیرمە بۆی گێڕاومەتەوە، بەڵام هیچیم لەبیر نەماوە.

هێندەم لەبیرە دەیگۆ: حەســـەن و مریەم ئەوە نیە کە لاوکبێژەکە دەیڵێ.

- باپیرت ناوی چی بوو، دەمێکە مردووە؟

+ میرزای ناو بوو، چل پەنجا ساڵێ دەبێ.

- گۆڕەکەی لە کوێیە؟

+ ئەو لە شار مرد، گۆڕەکەی لەوێیە.

- نازانی لە چ گۆڕستانێکە؟

+ لە ســەر راســپاردەی خۆی لە گۆڕســتانی گەورە ناشتیان.

- بە گۆڕەکەی دەکەویەوە؟

+ نــا، بــابم بەر لەوەی دنیــا بەجێبهێلێ، ســــەردانی گۆڕستانەکەی کرد و بە گۆڕەکەی بابی نەکەوتەوە.

- بابت ناوی چی بوو؟ برا و خوشکی هەیە؟

+ ناوی حەســـەن بوو، نا، بابم وەک باپیرم تاقانە بوو، منیش تاقانەم.

- ئێ، چیدی؟

+ هێندەشـــم لەبیرە، باپیرم کە دەیدی بەفر دەبارێ، لە چۆکی خۆی دەدا. تێنەدەگەیشـــتم بۆ وا دەکـات. ئـا،

ئێستاش ئەگەر شەوێک زۆر سارد بێ، خەڵک دەڵێن: شەوی حەسەن و مریەمە.

– باشە، ئێستا ئێرە لە زستانان بەفری زۆر لێدەکەوێ؟

+ جاروبار، زۆری لێبکەوێ ناگاتە بستێ، زۆریش نامێنێتەوە.

شوانە بە دوای بزنەگەلەکەیدا رۆیی و تۆش یەکپێ گەیشتیەوە لای ترۆمبێلەکەت. لاوکەکەت خستە سەر و بە دەم لاوکەوە بەرەو شار گەڕایتەوە:

((هەی پێدا پێدا

گوندێ وان وا لە دەو زێدا

حەسەن و مریەم هاتن پێدا

شورتە گازدەکات:

کوڕە، تفەنگێ خۆ بینە

جا حەسەن دەڵێ:

هۆ شورتەی بێ دینە

تفەنگێ نادەم بە بێ خینە

مریەم گازدەکات:

کوڕە حەسەنە، تفەنگ بدەی

بە خودا و پێغەمبەر چ غیرەتت نینە

دە پێدا، پێدا.......))

لە گۆڕستـــتان لە ریزی ئەو دوو گۆڕەی لە دڵی خۆت بە گۆڕی حەســـەن و مریەمـت دانـابوون. گۆڕێـک کە کەرتکە کێلێکی لای سەری مابوو، گوتت:

با ئەوەش کێلی پیری گێڕانەوە بێ.

گەیشـــتیەوە ماڵێ و پیری گێڕانەوەت کردەوە. بە دەم چاپکردنەوەوە بەدەنگی بەرز دەیخوێنیتەوە.

## ١٣

ئەوان لە بەفردا ونـدابوون. ئـاوایی دەسـتی لێ شـووشـتن. چاوەڕێ بوون ڕەشـەمێ بگات و بەفر ڕەشبێتەوە و تەرمی حەسەن و مریەم ببیننەوە. من یەک ئەگەری مانەوەی ئەوانم دانابوو، بەوەش دڵی دایکی وی و بابی ئەوم دەدایەوە. دەمگوت:

دڵتـان هەزارە نەکـات، ئەوان زینـدوون. هەبێ نەبێ، چەنـد تەختە دارێکیـان دۆزیوەتەوە و کەڵەکێکیـان چێکردووە و بە ڕووباردا ڕۆیشـتوون و لە پەنـایەکی گەرم و دوور لە مەترسی گیرساونەتەوە.

تا بەفر نەتوایەوە، تا ئاژەڵە کێوی و باڵدار نەگەڕانەوە لانە و هێلانەی خۆیان، من هەر وام بیردەکردەوە.

ئێ، لەهیکڕا ئاسمان گۆڕا. هەوری بەفراوی جێی خۆی دایە هەوری بـاراناوی. بـارانێ بـاری، بەسـتی هەنگوین بارانی وای بە خۆیەوە نەدیبوو. مینا کوندەی سەر بەرەو ژێر دەهاتە خوارێ. شـەو و ڕۆژێ خۆشـی نەکردەوە. زەوی سـپێتیی پێوە نەما. دنیا بن ئاو کەوت. بەسـت

هەستا، چ هەستانێ! بووە زێ. هاشوهووشی دەگەیشتە ئاسمانێ. شەپۆلی وای دەدا شاخی دەو کەناری دەلەرزاند. پردە دارینەکە بن ئاو کەوت و بزربوو. ئەو پردەی لە خەون و خەیاڵیشا ئاوی نەدەگەیشتێ. ماڵەکانی دەو زێ ترسیان لێنیشت. ماڵیان جێهێشت. ئاوایی هەموو لە خەمی پرد بوون، لێ بابی مریەم ترسی لێی نەبوو. گوتی:

ئاو هێلانەی هەڵۆ ببا، پرد نابا. من دەزانم چۆن چۆنیم رایەڵ کردووە و بەستووە.

هەر ئەویش ناوی لەو لافاوە نا، لافاوی دووەمی نووح.

دوای نیشتنەوەی لافاو ئەسپەشێ بزر بوو. کەس نەیزانی کەی و چۆن پەتکی پساندووە و لە تەویلە هاتۆتە دەرێ و بە جلەوە رووی لە کوێ کردووە. هەموو ئاوایی گەیشتنە ئەو باوەڕەی رووبار بردوویەتی. ئاخر کەس لایدەیەکی نەدیوە بێتە ئاوایی تا گومانی بۆ دزین بچێ. ئەسپەشێ لە وەچەی ئەسپەکەی بابی حەسەن بوو کە لە بەستی هەنگوین دەنگیدابۆوە. دەگێڕنەوە خۆی زینی دەخستە سەر پشتی خۆی. ئەسپێ بووە لە با تیژتر، لە باز سووکتر، خۆی لە بەر تیر و فیشەک لاداوە. بە چەپۆکان لەگەڵ نەیاری سوارەکەی شەڕی کردووە. لە کاتی برینداربوونی بابی حەسەن خۆی لە سەر دانابا،

بەجێینەدەهێشت. هەڵی دەگرت و دەیخستەوە سەر پشتی خۆی و دەیقووچاند. چەند جارێ ئەو کارەی کردووە و نەیهێشتووە شۆڕە سوارەکەی بکەوێتە دەستی نەیارانیەوە. هەر ئەوەش وای کرد، بە دەستی ئۆسمانییان خوێنی تێکەڵی خوێنی بابی حەسەن بێت و بە تەنیشت ئەوەوە گیان بسپێرێ. هەبوو دەیگۆ:

کوڕ چۆتەوە سەر باب، بەڵام ئەسپەشێ نەچۆتەوە سەر بابی خۆی.

هەندێکیش دەیانگۆ:

نا، رەسەنایەتی پاراستووە، بەڵام زۆر بە دیاری ناخات.

ئەسپەشێ هی دایکی حەسەن بوو. گوتبووی:

تا من بمێنم، دەبێ بمێنێ.

ئەو ئەسپە هێ لە حەسەن و کوشتەی مریەم، کەس پێی بە سەر پشتی نەکەوتبوو. سرک و سەرکێش بوو. بۆ کەس رام نەدەبوو. دەڵێن ئەسپەکەی بابی حەسەنیش تەنها بۆ سێ کەس کەمۆ بووە.

ئەسپەشێ لە ئاوایی دەسووڕایەوە و دەچووە ئاقار و دەهاتەوە تەویلەکەی خۆی. حیلاندنێکی تایبەتیشی

هەبوو. لە ئاقاری بەستی هەنگوین کەس ئەسپی لەو ڕەنگەی نەدیبوو. بە ئەسپەشێش ناوی ڕۆیشتبوو.

خوا کردی، زۆری نەبرد بەست بەرە بەرە نیشتەوە. پرد دەرکەوتەوە. وەک ئەوەی ئاوی نەدیبێ. ئاوایی ئاهیان هاتەوەبەر. باڵدار و ئاژەڵە کێوی ئەوانەی پەنایان بۆ ئاوایی هێنابوو، بە ئاسمان و دەشت و دەر کەوتنەوە.

دنیا بووە قوڕ و لیتەیێ، بەراز لێی دەرنەدەچوو. ئەو بەفر و باران و لافاوە گۆڕانێکی زۆری بە سەر ئاقاری بەستی هەنگویندا هێنا. لە زۆر جێ بەرزایی نەوی کرد، نەویانی پڕکردەوە. زۆر ڕژد و هەڵدێری هەموار کرد. ڕێی سەختی ئەشکەفتی گاوران و هێلانەی هەڵۆی هێند ئاسان کرد، هەموو کەس دەیتوانی بیگاتێ. لای خوارێی ئاوایی بەر لەوەی بگەیتە گۆڕی زەردە، لافاو حەفت هەشت گابەردی هێنابوو. هەر بەردێ هێندەی سێ گا، بە تەنیشتی یەکەوە ریزی کردبوون. نێوانیان هەر گەزێ، گەز و نیوێ دەبوو. بەردەبازێکی وای چێکرد، بە هیچ لافاوێ بن ئاو نەکەوتن. بەست زۆر هەستابا، سێ چوار بستیان بە دەرەوە بوو. لافاوی وێرانکەر تەنها ئەو کارە باشەی لێکەوتەوە. ئێستاش ئەو بەردەبازە وەک خۆی ماوەتەوە.

دوای ئەوە ئاسمان پەلە هەورێکی پێوە نەما، بە شەو سـایەقەیێ بوو، زەوی بەسـتی. یەکپارچە بووە زوقم و شەختە. بەستی هەنگوین بووە تەختە شووشە، جوولەی لێبڕا. کەپکە شاخی بە سەردا بکەوتایە، شەختە نەدەشکا.

دەبوو سـۆراغێکی مریەم و حەسـەن بکەم. ئەگەر پەنایەکی گەرمیان نەدیتبێتەوە، بەفریش رەقینەکردبنەوە، زوقم هەناسەیان لێدەبڕێ. نازانم چۆن بوو هێلانەی هەڵۆ و ئەشـکەفتی گـاورانم بیرکەوتەوە. دڵم گۆتی رەنگبێ پەنـایان بۆی بردبێ. وەک چۆن ئەو دوو ژن و پیـاوەی ملیان بۆ ئایینی نوێ نەدابوو، پەنایان بۆی بردبوو. ئەو سـەربردەیە پشـتاوپشـت هاتووە. کاتێ لەشـکری موسـڵمانان دەگاتە بەسـتی هەنگوین، ئەو چوار کەسـە دەست بە ئایینی خۆیانەوە دەگرن و نابنە ئیسلام. ناچار پەنا بۆ ئەو ئەشکەفتە دەبەن و نایەنەوە ئاوایی.

بەڵام حەسـەن و مریەم چۆن گەیشـتوونەتە ئەوێ! ئاخر رێی ئەوێ هەینێ زۆر سـەخت بوو. وەک ئێسـتا نەبوو، کەم کەس دەیگەیشـتێ. ئەوجـا بە بەفر و سـەهۆڵبەندانیش! ئەو شـەوە بابی وێ و دایکی ویش خەونی خۆشـیان دیبوو. بۆیان گێڕامەوە. خەونەکانیان پتر دڵمیـان روونـاک کردەوە. هێ لە هەنـدێش دایکی حەسەن گوتی:

دڵم دەڵێ بزربوونی ئەسپەکە مزگێنی خۆشی وەدوادا دێ. تۆ وەبیرت نایێ، حەسەن تەمەنی چوار پێنج ساڵێ بوو، دەمەو عەسرێ بزر بوو. جێ نەما سەری پێدا نەگرین، سۆراخی نەبوو. سەر لە ئێوارە ئەسپەکەشمان دیار نەما. کەس نەیزانی چی بەسەرهات. شەو درەنگ، ئەسپەکە حەسەنی وەدوای خۆیدا دابوو، هێنایەوە ماڵێ.
دڵم دەڵێ...

رێی هێلانەی هەڵۆ لە بەری ئاواییەوە بەو شەختەبەندیە سەختە و ماریش ئەستەمە بیگاتێ. بە سەر شەختەدا لە بەست پەڕیمەوە. دە دوازدە هێلکەی برژاو و مستێ قەسپ و نووردووە نانێکم خستە توورەگەوە. ئاخر دڵم دەیگۆ دەیانبینمەوە، برسیانە.

خۆم گەیاندە سەر تاتەبەردی بەرانبەر هێلانەی هەڵۆ. دەمویست لەوێوە بپەڕمەوە و بە رێی ئەودیودا هەڵگەڕێم. لە هیکرا لەو بەرەوە، سوارێک دەرکەوت. لە دەو بەستەکە لە بەرزەکەی دابەزی. وا دیارە دوو کەسی لە سەر پشتە. ئەوەی دابەزی پێی بەرزەکەی یەک یەک بەرز دەکردەوە دیار نیە بۆ وا دەکات. سواربۆوە و رێک بەرەو من هاژۆتی. لە ناوەندی بەست تفەنگی لێ راکێشام و دەنگی دام:

کێی زەلام؟

ناسیمەوە، هاوارمکرد:

کوڕە حەسەنی برام...

ڕێک لە سەر تاتەبەردەکە جڵەوی ئەسپەشێم لێی وەرگرت. لەو کاتەوە ناوم لەو تاتەبەردە نا تاتەبەردی دیدار. ئامێزمان پێکدا کرد. خۆم پێنەگیرا، ئامێزم لە مریەمیش وەرێنا. ئەوە یەکەم ئامێز و دوا ئامێز بوو. لەو سەرماوسۆڵە و زوقمە، ئامێزی مریەم گەرم بوو. تا ئێستاش گەرمیی وی لە گیانمدایە. وای، ڕەنگوڕوویان بە بەرەوە نەمابوو. کوڵمی جوانی مریەم لە پەلکە گوڵێکی ڕەشی ژاکاو دەچوو. حەسەن قاوەیی هەڵگەڕابوو. توورەگەم کردەوە. هێلکە و قەسپم لە پێش دانان. کەوتنە سەری، ئاهێکیان هاتەوەبەر.

گریانم هات، بە کوڵ گریام. فرمێسکم بە خوڕ دادەباراند. چەندێ پرسیاریان لێمدەکرد، گریانم ڕانەدەوەستا. زاری وەڵامدانەوەم گیرابوو. مریەمیش گریا. حەسەن بە توندی شانمی ڕاتەکاند و گوتی:

بەسە برا بەسە، بڵێ چ قەوماوە، کێ مردووە؟

گریان کەمێ هەوکمی بەردا:

هیچ، گریانی شادمانیە، گریانی دیداری ئێوەیە. داک و بابتان لە من ساخترن. مریەم فرمێسکی سڕی و گوتی:

زوو هەواڵی ئێمە بە ئەوان بگەیەنە.

پرسیم:

لە کوێوە بۆ کوێ؟ ئەسپەشێتان چۆن گەیشتێ؟

حەسەن گوتی:

جارێ لەو سەربردانە گەڕێ، دوایی دوایی، لە نووکەوە بۆت دەگێڕینەوە. ئێستا بڕۆوە ئاوایی. ئەگەر ویستت سبەی لە هەنگەوان دەمانبینیەوە. لە ماڵی بارامی هەنگەوان.

ئەو هەنگەوانە یەکێ بوو لە دۆستانی نزیکی خۆی. ماڵیان کەوتبووە لای پەڕگە، بەری گۆڕستانەکەی سەر بستیەکە. ئەو پیاوە لە ناو هەنگ و هەنگوین پەروەردە بووبوو. بەشێکی هەنگی بەستی هەنگوینی لە خۆی خڕکردبۆوە. ماڵیان لە هەنگ زەرد و سوور دەچۆوە. لە دوورەوە دەتگۆ پەلە هەوری بەر زەردەپەڕ داکشاوەتە سەر بان و حەوشەوبەرەیان. لە بەر هەندێ هەنگەوانی پێوە لکابوو. زۆر کەس گوندەکەشیان بە ناوی ویەوە دەناسیەوە. هەنگەوان بە پێی من دانە رۆژێک لە بەستی هەنگوینەوە دوورە.

دەبوو ناپاکیی کوشتەی مریەمیان بۆ باس بکەم، گوتم:

حەسەن، وریای ئەو شێت و شوورەش بن. ئەو بوو، هەواڵی هاتنەوەی تۆی بۆ کوشتەی لیرە بردبوو.

مریەم مستێکی لە سینەی خۆی دا و گوتی:

ئەویش گوللەیەکی من قەرداره.

گوتم:

پەژیوان بووەتەوە و بە دوو لەپان گوو دەخوات.

گوتی:

گووخواردن دادی نادات.

حەسەن گوتی:

مریەم تۆ دەستی خۆت بەوانە پیس مەکە، بۆ منیان لێگەڕێ.

پەلەیان بوو، دەبوو بڕۆن. لە ساتی رۆیشتنی چاوم کەوتە سەر پێی ئەسپەشێ. دەبینم هەر چوار پەلی لە ناو گۆرەوین. لێیان وردبوومەوە، لە پارچە لباد بۆیان چێکردبوو. ئەوان سەرەو هەنگەوان هەڵکشان و منیش بە مزگێنیی هەنگوینیەوە بەرەو دێی مریەم شۆڕبوومەوە.

ئەو شەوە لە تەنیشت بابی مریەم خەوتم. خەون دەیدامە خەون. بەیانی هیچیانم لە بیر نەما، تا هیچ نەبێ

بۆ خۆمیان بگێڕمەوە. لە ساتی ڕۆیشتنی دایکی حەسەن گوارەکانی لە گوێی خۆی کردەوە و گوتی:

بیاندە بووکە جوانەکەم.

## ١٤

کەوتیەوە ڕێ. لە نزیک گردی خوێن، داتەوە ئەو ڕێیەی دەچێتەوە گوندی هەنگەوان. تا گەیشتیە وێڕێ، چاوێکت لە لاڕێ و کوێرەڕێ. لە دووڕیانەکە دەستی چەپت گرت. لە هەورازەیێ سەرکەوتیت، ئاوایی دەرکەوت. لە بن گۆڕستانەکە وەستایت. چاوت لە ماڵی هەنگەوان گێڕا. بۆ ساتێ هەر وات زانی سەد ساڵ لەمەوبەرە. لە کوڕێژگەیەکت پرسی:

ماڵی بارامی هەنگەوان لە کوێیە؟

کوڕێژگە بە سەرسوڕمانەوە:

بارامی هەنگەوان کێیە؟

هاتیەوە سەرخۆ و گوتت:

مەبەستم ماڵی نەوەکانی ئەوە.

کوڕێژگە کەمێ بیریکردەوە:

باپیره گەورەی من ناوی بارامی هەنگەوان بووە. ئێرە ماڵی ئێمەیە.

لەو کاتە پیاوێ سەری لە دەرگای حەوشە دەرهێنا و فەرمووی لێکردیت.

حەوشە لە هەنگ زەرد و سۆر دەچۆوە. گوتت:

وا دیارە پشتاوپشت هەنگتان بۆ ماوەتەوە.

گوتی:

وایە، لە باپیرمان بۆمان ماوەتەوە. بارام هەنگەوانی باپیرم هەموو تەمەنی لەگەڵ هەنگ بەسەربردووە. هەمیشە هەنگی بە دەورەوە بووە. وەک ئەوەی گوڵ بێ، یان هەر خۆی شانەی هەنگوین.

قسە قسەی راکێشا:

- سەربردەی حەسەن و مریەمت بیستووە؟

+ ورد و باریکی سەربردەکە دەزانم. لاوکەکەم هەمووی لەبەرە. دەنگم خۆش نیە وەرنا بۆم دەگوتی.

- بێجگە لەوەی لە لاوکەکە هاتووە، چیدی دەزانی؟

+ وەک من بزانم ئەوەی بووە، لە لاوکەکەدا هاتووە.

- تۆ بڵێی وا بێ!

+ بڵێم چی، ڕەنگبێ.

نەوەی بارامی هەنگەوان لە بارەی حەسـەن و مریەمەوە زۆری گوت و ڕێسا. لاوکەکەی بە درێژی و تام و خوێی خۆیەوە گێڕایەوە. لە کۆتاییی گوتی:

+ لاوکەکە کەلێنێکی تێدایە، دەبوو باسی بکردایە.

- چ کەلێنێ؟

+ من لە مامەوە بیسـتوومە، حەسـەن و مریەم چەند شەوێک لێرە لە ماڵی باپیرم ماونەتەوە.

- چیدی؟

+ هەر هێندە، باپیرم پەنای داون و جلک و بەرگی نوێی داونەتێ و بەڕێیکردوون.

- تۆ باپیرتت دیبوو؟

+ نا، بابیشم نەیدیبوو. لە ناو لانک دەبێ بابی دەکوژرێ. وا بزانم هەر لە سـەردەمی حەسـەن و مریەم بووە کوژراوە.

- کێ کوشتی؟

+ نازانم، مامیشم نەیدەزانی. تەرمەکەیان لە دەو بەستێ، لە راسـتی ئەشـکەفتی گاوران دۆزیبووەوە و بکوژەکە نەناسرابوو. هەوکەشپێوە نەناسرا.

- ئەرێ لەبیرمچوو، ناوت چی بوو؟

+ حەسەنی خزمەتکارت.

ویستت سەرێ لە دێی مریەم بدەیتەوە، پەژیوان بوویتەوە و گەڕایتەوە لای پیری گێڕانەوە.

## ١٥

نوێژیان دوور لە چاوان بە سەر شەختە زوقمدا کەوتمە ڕێ. کزەبایەکی دێ، لە گوێزان تیژتر دەبڕێ. کاتێ لە ئاوایی دوورکەوتمەوە، هێواشم کردەوە. بڕۆ بڕۆ، تاو کەوت، سەرما کەمێ شکا، تاوەکەی خۆش بوو. وردە وردە شەختە دەستی بە توانەوە کرد. ڕێوبان شلدەبۆوە. خەمی هەڵخلیسکانم نەما. دەبوو لە ڕێ خۆم بگنخێنم و بە تاریکی بگەمە ئەوێ.

وای لە بەفر و بەستەڵەک! قڕانی خستۆتە باڵدار و بێباڵەوە. لەو ڕێیە گورگ و ڕێوی و چەقەڵ و کێرووشک و سمۆرەم دی، بە زەویەوە نووسابوون. چەندان جۆری باڵندەم دی سەریان لە قوڕ چەقی بوو. بەفر چ کارەساتێکی بە دوای خۆیدا هێنا!

لە بولێڵدا خۆم بە ئاوایی هەنگەواندا کرد. هەنگەوان بەر لە هەر شتێ هەواڵی هەنگ و هەنگوینی پرسی:

بەفر قڕانی تێخستن، لافاوەکە زۆری ڕاماڵی؟

گوتم:

پێناچێ هیچی دەرچووبێ.

ئاهێکی ساردی هەڵکێشا، پاش کەمێ گوتی:

خەمی ناوێ، من زۆرم هەیە. خلێف خلێف دەیاننێرمەوە بەســـت. رێنادەم بەســـتی هەنگوین بێ هەنگ و هەنگوین بمێنێتەوە.

حەســـــەن و مریەم گەرمـاویـان کردبوو. جلکوبەرگی نوێیـــان لەبەرکردبوو. وەک بڵێی هەنگەوان چـــاوەڕێی هاتنیانی کردبێ و چووبێ ســەر و دەستە جلکی نوێی بۆ کڕیبن. رەنگوڕوویـــان هـــاتبووەوە بەر. بەڵام لە چـــاوی مریەمەوە ســــوێ و ناســــۆرم خوێندەوە. چاوی پڕ لە کەسەر و پرسیار بوون. هاتە بەردەمم و بە هەوکی تژی لە هەنسکەوە:

+ کاکە، راستم پێبڵێ، بابم چی بەسەر هاتووە؟

– هیچ، بابت لە من ساخترە.

+ سوێندم بۆ بخۆ، بابم ماوە.

– بە چی دەڵێی ســـوێند دەخۆم، بابت بەڵای لێ نیە. چ بووە؟ خەونت نەدیبێ!

+ با، خەونی منیش یەکاویەکە.

- له خۆت خەنی، خەونی ئەوجارەت وەڕاست نەگەڕا.

+ خوابکەم.

- بە چاوی تۆ، بابت لە من ساخترە.

ئاهێکی هاتەوە بەر، هەستا و چۆوە چاوەکەیدی. ژنەکەی هەنگەوان گوتی:

مریەم لەوەتەی هاتووە، سەر بەرماڵی گرتووە. وا دیارە نوێژی زۆر چووە.

حەسەن گوتی:

دەیەوێ بە یەک رۆژ قەردی سی و یەک رۆژی خودا بداتەوە.

هەنگەوان بە پێکەنینەوە:

نوێژەکانی حەسەنیش قەلادەکاتەوە.

حەسەن نوێژی نەدەکرد، گوتبووی:

ئەشقیا نوێژی لە سەر نیە.

دوو شەو و رۆژێک لە ماڵی بارامی هەنگەوان مامەوە. حەسەن و مریەم بە دڵوداو سەربردەی سیِ و یەک شەو و رۆژەی خۆیانیان بۆم گێڕایەوە. یەک لە یەکی وەردەگرتەوە. من هەر چۆنی بگێڕمەوە ناگاتە گێڕانەوەی

ئەوان. ئێســـتــاش هەنـدێ گوتەی ئەوانم بە تـاوازەی خۆیانەوە لەبیرماوە، بەڵام هەندێکیان بە دارشـــتنەوەی خۆم دەیلێمەوە. ئەوان لەو گرتە و وێنـانەی تـایبەتن بە ژن و مێرد، خۆیـان لادەدا. بەڵام من لە چـاویـانەوە دەمدیتن و دەمبیســـتن. بۆیێ هەر قســـەی زار نا، هی چاویشیان دەگێڕمەوە:

دەو بەست و دەو بەست دێن. حەسەن لە زۆر جێ بە شان بەفر دەشکێنێ. لە راستی هێلانەی هەڵۆ هەڵدەکشێن. دەڵێتە مریەم:

چار نیە، دەبێ بگەینە ئەشکەفتەکە.

مریەم دەڵێ:

ئەشکەفتی گاوران؟

حەسەن:

بەڵێ.

مریەم:

بڕۆ، رێی ئاسمانیش بگری، لەگەڵتم.

خۆیشیان نازانن، لە ئاواییەوە تا ئەشکەفتەکە چەندیان پێچووە. چەنــد کەڕەت کەوتوونەتە بن بەفر و هێزی ئەوین رزگاری کردوون. هەر چۆنێ دەبێ دەگەنە نزیک

ئەشکەفت، بەڵام چۆن دەرگاکەی دەبیننەوە؟ بەفر هەوراز و نشێوی وێک گەیاندووە، ئەو باسک و تەلان و دوندانە تەخت و لووس، لە شـــێوەی باســـکی مریەم. هێ لە هەندێش بەفر دەپرووشـــێنێ چاو هێندە بڕناکات. بەڵام شـــوێن لە حەســـەن بزرنابێ، بە بۆنیش بێ دەیبینێتەوە. مریەم دەڵێتە حەسەن:

تۆ بڵێی ڕێمان هەڵە نەکردبێ و لەو دەوروبەرە بێ؟

حەسەن دەڵێ:

ئێرە وەک ماڵی ئێوە شارەزام. ڕێی دڵی خۆم بزربکەم، ئەشکەفتەکە بزرناکەم.

بەفر دەشکێنن و هەڵدەکشێن. لەپڕ مریەم دەڵێ:

حەسەن، بڕوانە، ئەها ئەوە دەڵێی ڕەشاییە؟

بە ئاراســـتەی پەنجەی مریەمدا دەڕوانێ، هەناســـەی ئۆخەی هەڵدەکێشێ:

هەوە، ئەوە هێلانەی هەڵۆیە، ڕێی نەداوە بەفر دەرگای لە سەر دابخات.

حەســـەن دەزانێ ئەشـــکەفتەکە چەنـدێ لە خوار هێلانەکەیە. بەفر هەڵدەداتەوە و ئەشـــکەفت دەردەکەوێ.

مریەم مینا کۆتری سەرمابردەڵە هەڵدەلەرزێ. حەسەن دەڵێ:

هەوکە ئاگرت بۆ دەکەمەوە، لە ژۆرێ هەندێ ورتکەدار هەیە.

مریەم کە چۆقەی ددانی رۆژە رێیەک دەپروا:

چووزانی؟

حەسەن:

بەر لە چەند رۆژێ هەندێکم کێشاوەتەوە ئەوێ.

مریەم دەڵێ:

+ دەترسم دەعبایەکی تێدا بێ.

- چ نیە، کەمێ خۆت لادە، ئێستا چارەی دەکەم.

تفەنگ سواردەکات و فیشەکێ بە ناو ئەشکەفتا دەتەقێنێ، هیچ لە گۆڕێ نیە.

ئیدی لە سەر زگ دەچنە ژۆرێ. بەوەی باشە ئەشکەفت لە هیچ لاوە ئاو نادا، وشکە، سەر دەرگاش لێژاییەکەی بە دیوی دەرێدایە.

خێرا سۆبە بەردینەکە دادەگیرسێنێ. دەڵێ:

هەوکە گەرم دادێ. بەرگەی کەمێ دووکەڵ بگرە، وا دەچم دووکەڵکێشەکەی دەکەمەوە.

مریەم بە دەم کۆخەکۆخەوە دەڵێ:

بەرگەی هەموو شتێ دەگرین.

دێتە دەرێ و شـــوێنی لوولەی بەردینی دووکەڵ دەبینێتەوە، بەفر هەڵـدەداتەوە. دووکەڵ ڕێڕەوی خۆی دەگرێ.

ســـۆبەی بەردین کە لەنزیک زارکێ ئەشـــکەفتییە. لە بەردێکی تایبەت چێکراوە. ئەو جۆرە بەردە لەو ناوە نیە. داخوا لە چ شاخێکەوە هاتووە، لە شێوەی تەنەکەیە، هەر هێنـدەی تەنەکەیەکی گەورەش دەبێ. دوو ڕووی بە شـــێوەیێ بە لا دیواری ئەشـــکەفتەوە لکێنراوە، دەڵێی بەشێکە لەو. دیواری سۆبەی بەردین تەنکە، دوو پەنجە نابێ. دووکەڵکێشـــەکەی بە ناو شـــاخەکەدا بە چەشـــنێ هەڵکەنراوە، باران نایەتەوە نـاو ســـۆبە. هەر لە نـاو دەرگاشـــەوە باکێش هەیە کونێکی گچکەیە، درێژدەبێتەوە بۆ ناو سۆبەکە. لێرەوە هەوای داگیرسان و نەکوژانەوەی بۆ دەچێ.

لە پژدێن بۆ خوارێ ئاویان لێ دەچۆڕێتەوە، بەڵام بۆ ســـەرێ تەڕ نەبووبوون. مشـــەما ئاوی نەداوە. ســـۆبە سووردەبێتەوە. دەکەونە خۆ وشککردنەوە.

مریەم دەڵێ:

ئێرە لە ناو زگی حەزیا دەچێ. بەڵام لێی ناترســـێم، چوونکێ لە تەک تۆم.

حەسەن دەڵێ:

نا، ئێرە ناو زگی حەزیا نیە، ناو زگی نەهەنگەکەیە.

مریەم:

کام نەهەنگ؟

حەسەن:

ئەو نەهەنگەی یوونســـی پێغەمبەری لە ناو زگی خۆی پاراست.

مریەم بە بزەیەکی شیرنەوە:

پێدەچێ وا بێ.

حەسەن:

وایە، دڵ لە دڵ مەدە. دەی تۆ خۆ گەرمبکەوە، من دەچم هەندێ دار دەهێنم.

مریەم بە پێکەنینەوە:

بۆ تۆ لە کوێی؟ لێت گۆڕاوە؟ داری چی!

حەسەن:

تۆ بوەستە، ئێستا دەبینی.

لە ئەشـــکەفتێ دێتە دەرێ. پاش ماوەیێ بە باوەشـــێ گزرەوە دەگەڕێتەوە.

مریەم چاوی زەقدەبێتەوە، حەسەن بۆی دەگێڕێتەوە:

لەو تەنیشـــتە بنگەوەڕێ هەیە. بایی زســـتانێ دارم لێی شاردۆتەوە، بە شێوەیەک کەس نایبینێتەوە.

مریەم:

بەڵام چۆن لە بن بەفردا پێیکەوتیەوە.

حەسەن بە پێکەنینەوە:

ئەو شتەی دەمەوێ، لە بن دەریاش بێ، دەیبینمەوە.

*ئێوە ئەو ئاقاری بەســـتی هەنگوینەی ئێســـتا دەیبینن ئەوەی ســـــەردەمی مریەم و حەســـــەن نیە. من هی ئەو سەردەمم. دەزانم چ بە داروبار بوو. لەو شـوێنە سۆرک و قەسـپۆک و سـەر کەپکە شـاخەکان گەڕێ کە لەوەتی دنیا دنیایە نەمـامێ، بنجێ، برکێکی لێ نەڕواوە. زەویە بژوێنەکـان هەمووی داروبـار بوون. بنە دارەبەن و بەڕووی وای هەبوو، دوو زەلام باوەشـــیان پێدا کردبا، ســـەری پەنجەیان نەدەگەیشـــتەوە یەک. دواتر بە هۆی*

*شەڕ و شۆڕەوە وای لێهات. لەشکری بەدووی بیابان هات و پێیوەرکرد، ئاگرێکی وای بەردانێ، بە قەد و رەگەوە سووتاندنی.*

دار دەخاتە سۆبەکەوە. بەو تەختە بەردە دەرگاکە دادەخات کە دەستێکی رەنگین پڕ بەو تراشیویەتی. هەر دەبێ هەمان بەردتاش بەردی زارکی ئەشکەوتەکەشی تراشیبێ. پڕ بەوە و کونبڕی دەکات.

ئەشکەفت کەمێ گەرم دادێ. خۆ دەگۆڕن و تەواو وشکدەبنەوە، حەسەن دەڵێ:

دەرگاکە دابخەم، ئێرە دەبێتە کوورە.

مریەم دەڵێ:

نەکەی کونبڕی بکەی، دەخنکێین.

حەسەن:

بایی هەناسە دەهێڵمەوە.

مریەم:

ئەدی ئەگەر بەفر دەرگاکە دابخاتەوە؟

حەسەن:

ئاگام لێی نابڕێ، زوو زوو سەری لێدەدەم. دەی ئێستا وەرە بۆ خۆت پاڵدەوە، زۆر ماندووی.

بەر لە داخستنی دەرگا مریەم کە تا ئەو کات جوان چاوی بە ئەشکەفتەکەدا نەگێڕابوو، لە سووچێکەوە لبادێک و شڕە جاجمێک، قوتە بێلێک، لە ناو دەلاقەیەکیش مەنجەڵێکی گچکە و لەگەن و بادی و کەوچکێکی دی. پرسی:

ئەوانە تۆ هێناوتن؟ وا دیارە پێشتر لێرە ماویەتیەوە، ئێرە بنەگەی تۆیە!

حەسەن:

چەند شەوێکم لێرە کردۆتەوە. وەک خودا لە دڵی نابم، ئێرە دەبێتە ماڵی ئێمە، بۆیێ هەندێ شتم هێنایە ئێرە.

مریەم:

ئەدی نەترساوی بە سەرت دادەن؟

حەسەن:

ئێرە زۆر سەختە. لە پشت و تەنیشتەکانی ڕێی سەرکەوتن نیە. تەنها ڕێی خۆ غلۆرکردنەوەی هەیە. شوێنێکی قایمە، لێرە کەسێ دەتوانێ شەڕی لەشکرێ بکات.

مریەم:

وایە، ئەو ساڵەی لەشکری ئۆسمانی شکا، شەڕەکە لێرە بوو.

حەسەن:

ئینگلیزیش بێ، لێرە دەشکێ.

مریەم:

دەزانم، بەڵام من لە دەسکێش و ناپاکان دەترسم، بە داوتەوە بکەن.

مریەم:

خەمت نەبێ، من دەزانم چی دەکەم.

نان دەخۆن. حەسەن سەرێ بە دەرێدا دادەگرێ. بەفر لێناکاتەوە. وێدەچێ رۆژ ئاوابووبێ. بەفری بەر دەرگا و چوار دەوری رادەماڵێ. سێ چوار پەلەدار دەخاتە سۆبەکەوە و دەڵێ:

- مریەم، چاوت داخە.

+ بۆچی، نیازی چیت هەیە؟

- تۆ دایخە.

چاوی داخست. لە کۆڵەپشتەکەی خەناوکەیێ دەردەهێنێ و لە ملی دەکات و دەڵێ:

دەمێکە بۆ تۆم هەڵگرتووە، ئەوەیان لەوە جوانترە کە کاتی خۆی بە زەردەدا بۆم ناردی.

مریەم گریانی دێ و خۆ بە ئامێزی دادەدات و چاوی ماچ دەکات. دەڵێ:

حەیف، من هیچم لا نیە بتدەمێ، دەمێکە سێویکم بۆت مێخەکرێژ کردبوو، لەبیرمچوو بیهێنم.

حەسەن:

من دوو سێوم بەسە! تۆ هەموو دنیات داومەتێ، تۆ دنیای.

مریەم بزەی هاتێ و سەری داخست. گوتی:

وای بۆ زەردە گریام، ئەو پێناوە لە پێناوی ئێمە خوێنی رژا.

حەسەن:

خوێنی ئەو سەگە و ئەوشۆی ئێمەی لە سەر ناچێ. واز لەوە بێنە، لە شەوێکی وا هەر دەبێ زاوا پاوەشانە بداتە بووکێ.

له سەر لباد و بن جاجم بۆ یەکەم جار دەچنە ئامێزی یەکترەوە و لەو شەوە بەفراویە هەنگوینی رەش و زەرد دەرژێنە یەکترەوە.

+ حەسەن، حەسەن، هەستە.

- چی بووە؟

+ هەستدەکەم بەفر دەرگای لە سەرمان داخستبێ.

هەڵدەستێ و بەردی دەرگا لادەدات. دەبینێ زۆری نەماوە بەفر دەرگا دابخات. بە قوتە بێڵەکە بەفرەکە رادەماڵێ. بەفر لێیکردۆتەوە.

دوو پەلە دار دەخاتە ناو سۆبەکەوە و دەگەڕێتەوە باوەشی مریەم:

- چۆن هەستتکرد بەفر دەرگای گرتووە، هەناسەت تەنگ بوو؟

+ نا، خەونم دی. لەو خەونە، دایکم کە شێوەکەیشم نایەتەوەبیر، گازیکردم: کچم ئاگات لە دەرگا بێ.

بە دەنگی وی وەئاگاهاتم.

حەسەن لەوەتەی ئەشقیایە، کێرووشکەخەو دەکات. لە شیرنەی خەوێ نیوە بە ئاگایە، کەچی ئەوشۆ لە ئامێزی

مریەمی دەڵێی بەرخی تێر شـــیرە، قووڵ و شـــیرین چووبووە خەوی. گۆتیە مریەم:

ئەشـــقیا نابێ وابێ، چاوێکی بخەوێ، دەبێ چاوێکی وەئاگابێ.

مریەم دەڵێ:

لەمەودوا من دەبمە چاوە وەئاگایەکەت.

هەوری بەفراوی بەری ئاســـمانی بەســـتی هەنگوین بەرنادات. بەفر دادەکات و دادەکات. بەفر شەو بە رۆژەوە گرێدەدات. ئەو کوڕ و کچە تەریوە وا بەو کێوەوە، لە ناو ئەشکەفتی گاوران، تۆ بڵێ ئەشکەفتی ئەوین. هێندەیان لە دەســـتدێ، ئاگر بکەنەوە، بەفر بماڵن، جاروباریش دەنکە قەســـپێ، دەنکە مێوژێ، کەرتکە گوێزێ بخەنە زاریانەوە. بۆ دەست بە ئاو گەیاندنیش سـەرێ بە ناو بەفردا بگرن. حەســـەن دادەمێنێ، مریەم دەزانێ بیر لە چی دەکاتەوە، دەست دەخاتە سەر شانی:

خەمت نەبێ، بەفر تا سـەر نابێ. تا هەینێ رۆژی سـەر و دەنکە مێوژێ دەخۆین، دەژیین و نامرین.

حەسەن دەڵێ:

بەفر چەندێ ئەســـتوور بێ، زریان دنیاش کاول بکات، رێم لێناگیرێ. من دەچم و خواردن پەیدا دەکەم.

مریەم دەڵێ:

مەگەر نـابینی دنیـا چۆنە؟ چوونە دەرێ واتە مردن، واتە نەگەڕانەوە.

حەسەن:

تۆ لێرە بی، بە ناو سەهۆڵبەنداندا، بە ناو ئاگردا بڕۆم، هیچم بەسەرنایێ، دەگەڕێمەوە.

مریەم:

تۆ بە تەنیا بە هیچ لایەکدا ناچی.

حەسەن:

لەوەیان بە قسەت ناکەم.

مریەم:

ناچاری.

حەسەن:

تکایە ئەوە مەڵێ.

مریەم:

من له تۆ لاملترم، قسەیێ بکەم، سەریشم له سەری دانێم، دەیگەیەنمه سەر. بۆیێ ناتوانی به تەنیا رێی مردن بگری.

حەسەن:

من له ناو سەهۆڵبەندانیش بم، ئەوینی تۆ گەرمم دەکاتەوه و نامرم:

مریەم:

وا دیاره هەستت به ئەوینی من نەکردووه، منیش وەک تۆم.

حەسەن:

من ئەگەر به تەنیا بڕۆم، ڕێ رێی ژیانه، بەڵام تۆ بێیت، دڵنیام ڕێ دەرناکەیت و تیادەچی.

به هەڵه چووی، ئیدی من قسەی خۆم کرد، تۆش بیخه بەر دڵی خۆت.

حەسەن تێداماوه، سەردەهێنێ و دەبات، چ بڕیارێکی پێنادرێت. ناوه ناوه دێته دەرێ. ئاسمان روونناببێتەوه. بەفر دنیای گرتووه. بەفرێک ئەگەر چیدیش نەبارێ، زەوی بایی وەرزێ بەفری گرتووه و رەشنابێتەوه.

تەواوی لە خوارێی ئەشکەفتەوە سەر هەڵدەبڕێ، دەبینێ هێلانەی هەڵۆ ڕەشدەچێتەوە. لە بەر خۆوە دەڵێ:

تۆش وەک ئێمە شەڕی بەفر دەکەیت.

لەو کاتە هەڵۆکەی دی، خۆی بە هێلانەدا کرد. لە بەر خۆوە:

خۆزگەم بە خۆت، تۆ لە من ئازاتری، دەگەڕێیت و دێیتەوە.

لە خۆوە ئاهێکی هاتەوەبەر، هاتەوە ژووری و گوتی:

هەڵۆکە لە گەڕان نەکەوتووە.

مریەم گوتی:

ئارام بگرە، ئێمەش باڵمان دەکرێتەوە، ڕێی فڕینی ئێمەش دەبێتەوە.

حەسەن:

دەترسم تا هەنگینی برسێتی بڕستمان لێببڕێ. باڵ هەبێ و نەبێ، کەڵکی هیچ نەگرێ.

مریەم:

دڵم دەڵێ برسێتی دەرۆستی ئێمە نایێ.

حەسەن:

تۆ برسـێتیت نەدیوە، لە ناوەوە هێدی هێدی دەتخوات، هێندە دەزانی لە پەلوپۆ کەوتوویت و شنگ و تینی گرتنی کیسەڵێکت تێدا نامێنێ.

مریەم:

تۆ برسێتیی لەو ڕەنگەت دیتووە؟

حەسەن:

نەمدیتووە، بیستوومە. لێ وا بڕوات، ڕەنگبێ ببیبنین.

مریەم:

بیری لێ مەکەوە، نایبینین.

حەسەن:

خودابکەم قسەی تۆ دەرچێ.

مریەم:

دەردەچێ، ترســـــی ناوێ، هاکا دیتت لە باڵماندا، لە دیار ئاگردان و نان نیشتینەوە.

## ١٦

لەگەڵ هەڵدانەوەی هەر لاپەڕەیەکی پیری گێڕانەوە، لە شوێنی خۆت تۆتکەناگریت. باڵ دەگریت و هەڵدەفڕیت. جێ جێ لە شوێنی داستانەکە دەنیشیەوە. لە گۆڕستانەوە بۆ گردی خوێن، لەوێوە بۆ گوندی هەنگەوان، دەگەیشتیەوە مریەم، دەگەڕایتەوە و دەسووڕایتەوە سەر تاتەبەردی دیدار. سەرێکت لە بەردی زنە دەدا، لە بەست دەپەڕیتەوە و بە باسکی ئەشکەفتی ئەوین و هێلانەی هەڵۆدا هەڵدەزنایت.

ئەورۆ خولیای دیتنی باکێش و دووکەڵکێشی سۆبە شکاوەکەت کەوتە سەر. پێشتر بە خەیاڵتدا نەهاتبوو بیانبینیەوە، چوویت. باکێشەکەت دیتەوە، پڕبۆتەوە. سەرکەوتیت، بە شوێنی دووکەڵکێش نەکەوتیەوە. لە ناو ئەشکەفتێ شوێنەکەی دیارە، ئەویش پڕبۆتەوە. بە شوێن پارچە بەردی دەرگای سۆبە و دەرگای ئەشکەفتدا گەڕایت، هیچت بەر چاو نەکەوت. بەوە نیگەرانی دایگرتیت. هەستت بە بزربوونێکی قووڵ کرد، بزربوونێ لە شێوەی ئەو چەند وشەیەی لە لاپەڕەیەکی داستانەکە

ڕەشـــبوونەتەوە و ناخوێندرێنەوە. وەک بزربوونی ئەو لاپەڕەیەی لێکراوەتەوە، وەک بڵێی کەســێ بە مەبەســت ئەوەی کردبێ و نەیویســتبێ بەر چاوی کەس بکەوێ. نەمانی سۆبە و دەرگای زارکێ ئەشکەفت و پڕبوونەوەی بـاکێش و دووکەڵکێش، لە دیدی تۆوە وشـــە و دێری لەدەستچوو بوون و کەلێنیان خستۆتە داستانی بەستی هەنگوینەوە.

لە ناو ئەشـــکەفتێ وێنەکان یەک یەک دەردەکەوتنەوە. نەوێرایت پتر بمێنیتەوە. هەستتکرد ئەو وێنانە ڕەنگبێ لە خەیاڵی خۆت بیانکێشـیت و پێشـانی خۆتیان بدەیتەوە. ڕەنگبێ تووشی ساویر بووبیت.

لۆژە لۆژ بەرەو بەســت شــۆڕدەبوویتەوە. دەنگی پیاوێک خەیاڵی پساندیت. کەوتنە قسە و باس:

+ دەڵێی لە ئەشکەفتی گاوران دێیتەوە؟

– نا، لە ئەشکەفتی ئەوین.

+ ئەوین لەوێ؟

– تۆ سەربردەی حەسەن و مریەمت بیستووە؟

+ لە لاوکان بیستوومە، بابیشم منی بە ناوی حەسەنی ناو لاوکان ناودێرکردووە.

- لە لاوک گەڕێ، لە ناو ئەو ئەشـــکەفتە ســـۆبەیێ هەبووە لە بەرد چێکرابێ؟

+ ئەها، مەبەستت ئاگردانی شەیتانە.

- شەیتان ئاگری لێدەکردەوە؟

+ دەگێڕنەوە لە وەرزی بەفر و باران شـــەیتان لەوێ دەمایەوە و بە دەستی خۆشی ئەو ئاگردانەی چێکردووە.

بە تیزەوە گوتت:

کاکە، شـەیتان خۆی زادەی ئاگرە، پێویستی بە ئاگر و گەرمبوونەوە نیە.

کابرا بە سەرسوڕمانەوە:

نازانم لە ئاگر چێبووە یان نا، بەڵام دەزانم کەس نیە پێویستی بە ئاگر نەبێ.

بزەیەکت بۆی کرد:

تۆ بـاوەڕت بەوە هەیە، شـــەیتـان لەو ئەشـــکەفتە مابێتەوە؟

کابرا بە پێکەنینەوە:

بڵێم چی! خۆت دەزانی شـــەیتـان لە هەموو جێیەک هەیە.

گوتت:

باشه، سەگ لە شەیتان بەردە. تۆ سۆبە بەردینەکەت دیبوو؟

کابرا کەمێ بیریکردەوە:

ئا، لەمێژە هێمان مووم لێنەهاتبوو، رۆژێک کەوتمە دوای کارمامزێکی بریندار، خۆی بە ئەشکەفتەکەدا کرد، بە دوایدا چووم، ئاگردانەکەی شەیتانم دیت.

گوتت:

من بیستوومە هەر کەسێ بچێتە ناو ئەو ئەشکەفتە، زۆر ناژی.

کابرا:

وایە، من کاتێ بە دوای مامزەکەدا چووم، ئەو گۆتەیەم لەبیرنەمابوو، دەنا نەدەچووم. بەڵام دوای ئەوە سێ سەر بزنم کردە خێر تا خودا نەمکوژێت. دیارە خێرەکە جێی خۆی گرت.

گوتت:

ئەدی نازانی لە کەیەوە نەماوە؟ کێ بردوویەتی؟

کابرا:

لەو ســـاڵانەی دوایی دوو ســـێ عەجەم لەو دیوەوە هاتبوون و بردبوویان. بیســـتمەوە گوتبوویان: ئەو بەردە زۆر گرانبەهایە.

گوتت:

دڵنیای عەجەم بوون؟

گوتی:

ئا، بە زمانی عەجەمان دەدوان.

پرسیت:

- کەس ڕێی لێ نەگرتن؟

+ بۆچی ڕێیان لێ بگرن، ئاگردانی شەیتان کەڵکی چی هەیە؟

- دیارە نەتانزانیبوو بەردێکی بەنرخە.

+ نا، بەڵام خەڵک بشـــیانزانیبا، ڕێیان لێ نەدەگرتن. زۆر کەس پێیان خۆش بوو، ئاگردانی شەیتان نەما.

- هەموو شتێکمان دزرا و...

+ گرنگ ئەوەیە ئایینەکەمان بمێنێتەوە و نەدزرێ.

- با وا بێ، کاک حەسەن.

ماڵاواییت لە حەســەن کرد و لە بەر خۆتەوە گوتت: چ دوور نیە منیش بە ناوی حەســـــەنی مریەمەوە ناودێر کرابم!

لە کاتی بەڕێکەوتنەوە هەڵۆ زەردەکەت دی، بەرە و هێلانەکەی دەچۆوە. گەڕایتەوە و چوویتەوە گژ پیری گێڕانەوە.

## ١٧

بەفر لێناکاتەوە. ڕێبەندان نابڕێتەوە. حەسەن لە مریەم دەپاڕێتەوە:

ئەگەر منت خۆشدەوێ، باڵم بکەوە. هەڵۆ ئاسا دەفڕم و زوو دەگەڕێمەوە. تۆ باش منت نەناسیوە، بەفر بە هەڵۆ بوێرێ، بە من ناوێرێ.

مریەم دەڵێ:

ئەگەر لە خۆم خۆشترم نەویستبای، ڕێمدەدای بڕۆی. ئەو بەفرە هی خۆ لێدان نیە.

حەسەن:

ئەو هەورە هی ئەوە نیە وا زوو هەڵیپرینگێنێ. ئەو بەفرە بەم زووانە ناتوێتەوە، ڕەش نابێتەوە. بۆچی لە برسا بمرین، ئاخر خەڵک چیم پێدەڵێن؟ ئەگەر بزانن، مریەمم لە برسا کوشتووە و ڕێی پەیداکردنی تیکە نانێکم نەدۆزیوەتەوە.

مریەم:

بە من بڵێ ئەگەر مردن بێتە پێشـــێ، حەزدەکەی هەر یەکەمـان لە شـــوێنێ و دوور لە یەکتر بمرین، یـان لە ئامێزی یەکتر؟

حەسەن:

باســی مردنی خۆت مەکە، بەڵام حەزدەکەم لە ئامێزی تۆ بمرم.

مریەم:

کەواتە بە تەنیــا مەڕۆ، چوونکێ دڵنیــام لە بەفردا ڕەقدەبیەوە و نـاتبینمەوە. منیش دوای تۆ لێرە بە تەنیـا سەر دەنێمەوە.

حەسەن:

مریەم وا مەکە، من لە پێنـاوی تۆ بـا ببمە ڕێویەکی گەڕۆک نەک شێرێکی نووستوو.

مریەم:

شـــێری من دەبێــت بزانێ کەی دەخەوێ و کەی دەگەڕێ. ڕۆژی گەڕان نیە.

حەسەن:

ئاخر...

مریەم:

چیدی لە ســەری مەڕۆ، یان پێکەوە دەڕۆین و لە ناو بەفریێ لە ئـامێزی یەکتر گیـان دەســـــپێرین، یـان لێرە، چاوەڕێی بەزەیی خودا دەکەین. هێشـتا چەند دەنکە مێوژ و قەسپێکیشمان ماوە.

حەسەن:

کیژێ، من خەمی تۆمە. ســـەد ســـاڵیش نە بخۆم و نە بخۆمەوە، تەنها ماچی لێوی تۆم هەبێ، دەژیم.

مریەم:

خەمی منت نەبێ، منیش بە ماچ دەژیم.

حەسەن:

وایە، بەڵام...

مریەم:

هیچ بەڵامێکی نــاوێ، وا مەکە ئەو ئەوینەی بەر لە حەفت ساڵ لە پایزێ چرۆی کرد، لە ناو بەفردا...

حەسەن:

تەواو چیدی مەڵێ، بەڵام لەبیرت بێ، ئەوینی من بۆ تۆ حەفت نا، نۆ ساڵە.

دەخزێنە ئامێزی یەکتر، لە شـــێوەی لاولاو تێکدەئاڵێن. دەکەونە خەوی قـووڵەوە. مـریەم خەون دەبـینـێ. لەو خەونە منداڵێ کە تازە سـەر پێ کەوتووە، لە سـەر دەرگا راوەســـتاوە و لە ســـەرما هەڵدەلەرزێ. گریانی منداڵەکە وەئاگای دەهێنێ.

هەسـتدەکات کەسـێک لە بەر دەم زارکی ئەشـکەفتێیە، بە نەرمی:

حەسەن، هەستە، کەسێ، شتێ لە پێش دەرگایە.

حەســـەن قیتدەبێتەوە. دەســـــت دەداتە تفەنگەکەی. هەستڕادەگرێ:

هەبێ نەبێ خەونت دیوە، بەم بەفرە شـــەیتانیش ناگاتە ئێرە.

بە ئەســـپایی بەردەکە لادەدات، وای چ دەبینێ! دەڵێتە مریەم:

بڕوانە چ مێوانێکی نازدار هاتووە.

مێوان بێ فەرمووکردن خۆی بە ژۆرێدا دەکات، مریەم چاوی زەقدەبێتەوە و دەحەپەسێ و زمانی دەگیرێ.

مێوان کارمامزێکی چاو کەژاڵی گەردن بە خاڵە.

مریەم درەنگ زمانی دەبێتەوە و دێتەوە ســـــەرخۆ. دەست بە ملی مامزدا دەهێنێ و دەڵێ:

گیانەکەم، تۆ منداڵی ناو خەونەکە بووی!

حەسەن:

ئێستا دەچم ئالیکی بۆ دەهێنم.

مریەم بە سەرسوڕمانەوە:

ئالیک! مەگەر بەفری بۆ بهێنی.

حەسەن:

لە ناو دارەکان پووشـــــی کورتان زۆرە، نەرمە، لە گیا نەرمتر.

بە باوەشـــــێ پووشـــــەوە دەگەڕێتەوە. مامز دەکەوێتە ســـــەری و وەک حەلوا لوولی دەدا. هەر لەو مەنجەڵەی خۆیان بەفریان تێدا دەتواندەوە و دەیانخواردەوە، ئاوی لە پێش دادەنێ. چۆڕبڕی دەکـات. مـامز بە چـاوە گەشـــــەکانی ســـــەیری هەردووکیان دەکات. لە زاریەوە دەنگێک هات، کەسێ لە زمانی تێگەیشـتبا، سـوپاسـی لێ دەخوێندەوە.

مامزی ســـــەرمابردەڵە بووە پشـــیلەی دیار ئاگردان. مریەم خســتیە ئامێزیەوە و لە ســۆبەکەی نزیککردەوە و دەست و پێی گەرمدەکردەوە.

حەسەن لە بەر خۆوە:

کاتی هاتووە، ناچارم.

چەقۆی دەرهێنا، دەســـــتی دەلەرزی. مامز وەک بڵێی هەستیکردبێ رۆژی هاتووە، سێ چوار دڵۆپە فرمێسکی درشـــــتی داباراند. تێگەیی چ چارەی نیە، ناچار چاوی داخســـــت و خۆی رادەســـــتی چارەنووس کرد. مریەم بە سەرسوڕمانەوە:

ئەوە نیازی چیت هەیە؟!

حەسەن:

زۆر لە دڵم گرانە، لێ ناچارم.

مریەم:

نابێ، ئەوە کاری نەکردەیە.

حەسەن:

دیاریی خودایە. خۆت دەزانی هەر گیانلەبەرێ چەقۆی لە سەر بێ، بۆ مرۆڤ رەوایە. خودا بە گوناح نایینووسێ.

مریەم:

لە دیاری و گوناح گەڕێ، من چەقۆم لە سەر بێ، ئەو مامزە لە سەری نیە.

لەو ساتە مامزەکە چاوی کردەوە و لە چەقۆی روانی. مریەم بە گەرووی پڕ هەنسکەوە:

تۆ دەتوانی منداڵی ناو خەونەکەم سەربڕی!

حەسەن:

لە دڵەوە هەست بە نیگەرانی دەکەم، بەڵام ناچارین.

مریەم:

کوڕە، تۆ لە چاوی بڕوانە، لە چاوی منەوە لە چاوی وی بڕوانە.

حەسەن وردتر لە چاوی مامز وردبۆوە. نیگای لە سەر چاوی مامزەوە گواستەوە سەر چاوی مریەم، لە چاوی مریەمەوە بۆ چاوی مامز، چاوەکان بە شێوەیێ تێکەڵاوی یەکتر بوون، بۆی جیانەدەکرایەوە، کامیان هی مریەمن، کامیان هی مامزن. لەپڕ لەرزی هاتێ، دەستی شل بوو، چەقۆ کەوت. هەردووک وێکڕا ئامێزیان بە مامزدا کرد. مامز بە وێنەی منداڵێکی ترساو خۆی بە ئامێزیانەوە نووساندبوو، بە توندی هەناسەی دەدا.

حەسەن ماچێکی چاوی مریەمی کرد و گوتی:

تەواو، مامز چەقۆی لە سەر نیە.

مریەم:

مامز کەسێکە لە ئێمە، منداڵێکی جوانکیلەیە.

حەسەن:

نۆبەرەمان ئەگەر کچ بوو، ناوی دەنێین مامز.

مریەم:

ئەگەر کوڕ بوو، با هەڵۆ بێ.

حەسەن:

حەزدەکەم هەڵۆکە رەش بێ.

مریەم:

بە دڵی من بێ، زەرد بێ جوانە.

حەسەن:

با رەش بێ، بەڵام لە بەر دڵی تۆ، کەمێ لە زەردیشی تێدا بێ. بەڵام کچەکە هەر دەبێ رەش بێ و کتومت لە دایکی بچێ.

مریەم چەقۆکە هەڵدەگرێتەوە و دەیخاتە بن لبادەکەوە و لە چاوی مامز دەیشارێتەوە.

مامزەکە وێدەچێ ترسی چەقۆ لە بەفر پتر سەرمای کردبێ، لە ئاگرەکە نزیکدەکەوێتەوە. مریەم، دەڵێ:

بڤ، چەچەت دەسووتێ.

مامز تێگەیی، کەمێ کشایە دواوە.

مامز و مریەم هۆگری یەکتر دەبن، لە دایک و ساوا دەچن. پووشی بۆ قرچوبڕ دەکات و بۆی رادەگرێت. زۆر جار دەیهێنێتە سەر جێیەکەی و لچکی جاجمەکەی پێدا دەدات. مامز بۆن بە سینگ و مەمکی مریەمەوە دەکات. مامز ترسی لە حەسەنیش دەشکێ، ناوە ناوە دەچێ سەر بە رانی دەکات.

شەو دەبڕێتەوە، رۆژ دێ و دەبڕێتەوە، بەفر نابڕێتەوە و نابڕێتەوە. بەو چەند شەو و رۆژە بایی چل زستان بەفری تێکرد.

لەپڕ مریەم دڵی تفەنگ دەخوازێ. حەزدەکات فێری تەقەکردن و نیشانشکێنی بێ. حەسەنیش بە پێویستی دەزانێ، دەڵێ:

ئێستا تۆش وەک من ئەشقیای، ئەشقیا ئەگەر نیشانشکێن نەبێ، حەفتەیێ ناژی.

فێری سـوارکردن و چـاو لە سـەر سـێرە و هەناسـەڕاگرتنی دەکات. دێنە دەرێ و دوو فیشـەک بە بەفرەوە دەنێ، کە لە خوار زارکی ئەشـکەفتێ هێندەی لادیوارێ هەڵدراوەتەوە، مریەم ترسی لە تفەنگ دەشکێ، دوای دوو فیشەکەکە مستێ لە سینگی خۆی دەدات:

چیمان کرد! تۆ بڵێی ئاوایی گوێی لێ نەبووبێ.

حەسەن پێدەکەنێ:

بەو بەفر و زریانە مەترەلۆزیش بتەقێنی، دەنگی ناڕوا.

مریەم دەڵێ:

فیشـەکمان دەبڕێ، دەنا حەزدەکەم ڕۆژی فیشـەکێ بهاوێژم.

حەسەن:

ڕۆژی سـێ فیشـەک بۆ تۆ، لەو بنگەوەڕە، بـایی لەشـکرێ فیشـەکم شـاردۆتەوە. زۆرە، بەفر بنی بێ، فیشەک بنی نایە. تفەنگێکم لە شوێنێ شاردۆتەوە، لێرەوە دوورە، دەنا بۆتم دەهێنا. دەی با سـەرمات نەبێ، بڕۆ ژۆرێ. من هەندێ دار و پووش دەهێنم.

مریەم:

با ئەو سەرما و سۆڵە ببڕێتەوە، خۆشم لەسەر دانابێ، فیشەکێ بە سەری کوشتەی لیرەوە دەنێم.

حەسەن:

تۆ دەستت دەچێتێ چ پیاوێ بکوژی؟

مریەم:

ئەو پیاو نیە، دڕندەیە.

لە گەڕانەوە لە بەر دەم زارکی ئەشکەفتێ تەپەیێ هات. دیتی کەوێکە هەموو گیانی خوێنە، لە سەر گیاندانە. خێرا ملی هەڵکێشا. سەری هەڵبڕی، دەنگی باڵی هەڵۆ هات. گازی مریەمی کرد:

دیاریی هەڵۆش وەرناگری؟

مریەم کەوی دی حەپەسا، حەسەن گوتی:

باوەڕبکە، من راوم نەکردووە، هەڵۆ هێنای.

مریەم:

باوەڕدەکەم، شەوێ دی خەونێکی لەو شێوەیەم دی.

کەویان چاکرد و خستیانە ناو مەنجەڵەوە و پشکۆی گەشیان لە سۆبە دەرهێنا و خستیانە سەری. مریەم گوتی:

خۆزی تۆزێ خوێش هەبا.

حەسەن:

خوێ هەیە، لە یەکێ لە دەلاقەکان هەبوو.

مریەم هەستا، پرێسکەیەکی گچکەی دیتەوە، هەر هێندەی مستێ دەبوو، خوێی تێدا بوو. یەک دوو پتی تێکرد. هەر یەکە و باڵ و رانێکیان خوارد. چەلاویان فڕکرد. سینگ و مل و سیقەتۆرە و ئەوانەیان هێشتەوە.

حەسەن گوتی:

دەبوو زووتر بزانم هەڵۆ بێ نێچیر نابێ. رۆژانە کە دەفڕێ شتێ لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە. دەبێ لەمەودوا بەشمان بدات.

مریەم دەڵێ:

تۆ چ دەڵێی، دەبێ لێی بەربووبێتەوە، یان بۆی بەردابینەوە؟

حەسەن:

هەڵۆ هۆشی لە کوێ بوو!

مریەم:

دڵی من وا ناڵێ.

حەسەن:

ئەدی چی دەڵێ؟

مریەم:

نازانم، بەڵام رازێک لەوەدا هەیە.

حەسەن:

دوور نیە.

رۆژی دوایی دیســـــان باڵدارێک کەوتە پێش زارکی ئەشکەفتێ. لە کەو گەورەتر بوو، لە پۆڕ دەچوو. وەها لە خوێن گەوزیبوو نەدەناســــرایەوە. پێدەچوو تازە مردار بووبێتەوە. حەسەن هەڵیگرتەوە و سەری لێکردەوە. خێرا پەڕ و تووکی لێکردەوە، مرداربوونەوەکەی لە مریەم شاردەوە. هاواریکرد:

مریەم گیان، وا دیارە رۆزیمان لە چنگ و دەندووکی هەڵۆیە.

مریەم گوتی:

ئەوە خودای مــامزەکەیە بە هەڵۆدا بۆمــان دەنێرێ. وریابە، مامز چەقۆکە نەبینێ.

حەسەن:

به مامزەکە بڵێ: چەقۆ لە ملی خۆم بسـوووم، لە ملی وی ناسووم.

رۆژی سـێیەم مریەم هەڵۆکەی دی بە نێچیرێکەوە خۆی کرد بە هێلانەدا. چاوەڕێ بوو نێچیری بۆ بەرداتەوە، بەرینەدایەوە. گازی حەسەنی کرد:

وەرە دەری، وا دیارە هەڵۆ من ناناسـێ، نێچیری نەدامێ.

حەسەن:

رەنگبێ بۆی کردبینە رۆژێ نا رۆژێ.

مریەم:

راست بڵێ، دەیداییێ یان لێت دەستاند؟

حەسەن:

بە چاوی تۆ، چۆنم گوت، بەو شێوە بوو.

حەسـەن گوزوگۆم بە وێنەی پڵینگ هەڵگەڕا. بەفری شکاند و گەیشتە بەر دەم هێلانە. سووکە شەڕێکی لەگەڵ هەڵۆ کرد و بە نێچیرەوە هاتەوە. گوتی:

مریەم:

هەڵۆ مامز نیە، لە بن بەفریش راوی خۆی دەکات، بۆیە نەڵێی بەشی ئەو دەخۆین.

مریەم:

نا، وا ناڵێم، وا دیارە خودا وای نووسیوە، نانمان لە دەستی هەڵۆ بێ.

ئیدی لەو سی و یەک شەوەی ئەشکەفتی ئەوین، چواردە رۆژیان بە هۆی هەڵۆوە دەژین. جا بە خواستی خۆی نێچیری بۆ بەردابنەوە، یان بە زۆر لێیان سەندبێ. مامزەکەش بە پووشەنەرمەی حەسەن.

دوو ئەویندار نەخشەی دوای رەشبوونەی بەفر دەکێشن. حەسەن دەڵێ:

دەتبەمە شوێنێ لە خۆم زیاتر کەس دەستی نەتگاتێ، هەڵۆش نەتگاتێ.

مریەم:

هەر کوێ دەڵێی دێم، بە مەرجێ هەمیشە لە تەکم بی.

حەسەن بە پێکەنینەوە

واتە لە ئەشقیایی بکەوم و...

مریەم بە نیگەرانیەوە:

نـــا، دەبینە جووتە ئەشـــقیـا، من دەبمە یەکەم ژنە ئەشقیای بەستی هەنگوین.

حەسەن بە خەمبارییەوە:

ئەشقیایی هێندە سانا نیە، زەحمەتە بە تۆ...

مریەم لە دڵەوە:

وام دەبینی؟ رادێم، تۆ تفەنگێکم بۆ پەیـداکە، هەینێ دەبینی.

حەسەن لە دڵەوە:

من هەر وام دەزانی، تۆ لە جوانی و شیرینی و ناسکی و شـــلک و تەنکی لە دنیایێ تاکی. چ بزانم لە شـــنگ و تینیش هیچـت لە من کەمتر نیە. رۆیینی نـــاو بەفرت سەلماندی بەرگەی ئەشقیاییش دەگری.

مریەم:

ئەگەر وایە، بۆچی دوودڵی؟

حەسەن بە سۆزەوە:

بەڵام ئەدی لە کاتی دووگیانی؟ دەزانی خەونم دی تۆ دووگیان بووی.

مریەم بە نازەوە:

هەینی دەچمە ئەو شوێنەی تۆ دەیڵێی.

چەند رۆژێ بەر لەوەی دنیا بن ئاو بکەوێ، حەسەن کاتێ دەستی بە سینەی مریەمدا دەگێڕا، لەپڕ سەری پەنجەکانی وەک برووسکە لێیدابن وابوو. راچڵەکی، لە جێی خۆی وشکبوو. دەستی کێشایەوە و بێ دەنگ ما. مریەم هەستیکرد شتێ هەیە. دەستی لە سینەی خۆی گێڕا. ئەو شوێنەی دیتەوە کە پەنجەکانی حەسەنی تەزاندبوو، ئەویش تەزی. بە سەر خۆی نەهێنا. نە لەو قسە، نە لەم قسە، وەک بڵێی هیچ لە گۆڕێ نەبێ، بەردێکیان لە سەر دانا.

رۆژێ بەر لەوەی دنیا بن ئاو بکەوێ، ئاسمان دایکردە گژگژەک. دڵیان بەوە خۆش بوو، هیچ نەبێ بەفر کەمێ دەتوێتەوە و لە کەمی دەدات.

تا ئەو بەرەبەیانە دنیا زۆر کپ بوو. کپیەکی سام لێنیشتوو. هێند کپ وەک ئەوەی گیانی لە بەردا نەمابێ. هێ لە مریەم و حەسەن و مامز و هەڵۆ جوولە لە هیچ شتێکەوە نەبوو. دنیا تەواو هەناسەی لێ بڕابوو. کزەبایەکیشی نەدەهات، تەنها بەفر و بەفر و بەفر.

مریەم حەسەنی وەئاگاهێنا. ئەو کوڕە ئەشقیایە کە بە دەنگی پێی پشیلە وەئاگا دەهات، لەوەتەی لە باوەشی مریەم دەخەوێ، خەوی گران بووە:

هەستە، حەسەن هەستە، دنیا وا وێران دەبێ.

دەرگا کەمێ لادەدەن، هاشـــوهووش و خورەخورڕێکە گوێ کاس دەکات. چ بارانێکە، ئاســـمان کونی تێبووە و وەک بڵێی دەریای لێوە هەڵبرژێ. وەک چۆن چ زســـتانێ وێنەی ئەو زســـتانە بەفری وای نەدیبوو، بـارانی لەو شـێوەشـی نەدیوە. کارمامزەکەش ترسـی لێ نیشـت و لەگەڵ ئەوان کەوتە هاتوچۆ.

مەترسی ئاو هاتنەژۆرێ هەیە. حەسەن مشەماکەی بە سەر خۆی دادا و قوتە بێڵەکەی دەستدایێ و گوتی:

ترست نەبێ، چارەی دەکەم.

چووە دەرێ و لە بەفری هەڵدراوە جۆگەیەکی بە سەر هەڵدێرەکەدا کردەوە. شەستەباران ئەو ڕۆژە لێینەکردەوە. وەک ئەوەی زەوی بن دەریا کەوتبێ، وا بوو. لە شـەو و ڕۆژێکدا ئەو شـــاخ و باســـک و تەلان و دۆڵانە کەویە بەفرێکیان پێوە نەما. ئەو ئاقارە لە ســـپێتیەوە گۆڕا بۆ سۆری و ڕەشـی و خۆڵەمێشـی. هەر ڕەنگێکت دەویست هەبوو، ســـپی نەبێ. ئاســـمان پەلە هەورێکی پێوە نەما. شـــین شـــین، ســـوخمەکەی مریەم دەڵێی تیلمێکە و لەو بڕاوە. بایەکی سـارد هەڵیکردووە. کەس لە چاوەڕێی بای وا نەبوو. شـەوەکەی ئاسـمان یەکپارچە بووە ئەستێرە.

مانگ هێند نەوی بوو، لەگژ بوو لە بەردەم زارکی ئەشکەفتی ئەوین بنیشێتەوە.

مریەم دەڵێ:

ئەو زستانە بە زستان ناچێ، وێدەچێ شتێکی لە چاو بێ.

حەسەن:

لە چاوی بوو، ئەوە نیە من و تۆی پێکگەیاند.

مریەم:

خوابکەم هەر ئەوە بێ، شتی خراپ لەگەڵ خۆی نەهێنێ.

حەسەن:

دڵت هەزارە نەکات، بیر لە شتی خراپ مەکەوە.

ئێستا قسە لە رۆیشتن دەکەن. بەرەو کوێ سەری خۆیان هەڵبگرن. دڵی مریەم رۆژهەڵات دەخوازێ، حەسەنیش رۆژاوا، ناگەنە یەک. هەرچەندە حەسەن رێک و راست هۆکارەکە ناڵێ، بەڵام مریەم تێدەگات. چەندی دەکات و دەکۆشێ، کەڵکی نابێ و حەسەن سوورە لە سەر رۆژاوا، دەڵێ:

مریەم، لەوەیان بە قسەت ناکەم.

مریەم ناچار ملدەدات.

بەر لەوەی خۆ خڕبکەنەوە، دەیانەوێ مامزەکە بەڕێبکەن. مریەم ڕووی تێدەکات:

بڕۆ چاوکەژاڵەکەم، ئومێدەوارم لە تەمەنت تووشی چەقۆ و گورگ نەبی.

حەسەنیش پێیدەڵێ:

زوو بگەوە گەلە، چاو لە من مەکە، ئەوەی ئاوگەلە بێ، گورگانخواردوو دەبێ.

ئامێزی ماڵاوایی بە مامزدا دەکەن. دەرگا دەکەنەوە و پێش خۆیان دەدەن. مامز بە نابەدڵی دەچێتە دەرێ. بایێ هورژم دێنێ، هێند ساردە، بەرد شەقار شەقار دەکات. کەمێ دەڕوا، ئاوڕیان لێدەداتەوە، بە تاو دەگەڕێتەوە و خۆی بە ئەشکەفتا دەکاتەوە.

مریەم دەڵێ:

وا باشە ئێمەش بمێنینەوە، لەو سەهۆڵبەندانە رێ دەرناکەین و تیادەچین.

حەسەن:

قسەیتی، دەمێنینەوە.

هەڵۆ بە نێچیرێکەوە گەڕایەوە. حەسەن خۆی گەیاندە هێلانەکەی. لێی وەرگرت و گوتی:

ئەوەیان بۆ ئێمە، برۆ یەکی تر بۆ خۆت راوبکە.

هەڵۆ تێگەیی، لە شەقەی باڵی دا، ئەوانیش هاتنەوە ناو ئەشکەفتێ.

ئاسمان سایەقە و زەوی شەختە و زوقم. وێدەچێ ئەوەش تەمەنی بەفرەکەی هەبێ و وا زوو نەبڕێتەوە. چێشتانێ حەسەن دەڵێ:

رێوبان بەستوویەتی، لێ ناتوانین زێتر بمێنینەوە، ناچارین بڕۆین.

مریەمیش دێتە رایێ.

ئەو دارودرەی لە ناو ئەشکەفتە، خڕی دەکەنەوە و دەیبەنەوە بنگەوەرەکە و جوان دایدەپۆشنەوە. خۆڵەمێشی سۆبەکە دەردەدەن. شوێنەوارێکی ئاوەدانی لەو ناوە ناهێڵن.

حەسەن لە لبادەکە دوو پارچە دەبڕێ.

+ بۆ چیتە؟

– لە پێی ئەسپەکەی هەڵدەکێشم، با هەڵنەخلیسکێ.

+ ئەسپی چی!

- ئەسپەشێ لە خوارێ چاوەڕێمان دەکات.

+ کێ هێناویەتی؟

- کەس، جارێ لەوە گەڕێ.

+ تۆ نەتهێنابێ.

حەســەن وەلاّمناداتەوە، مریەم ســەردەهێنێ و دەبات، ســــەرەدەری لێدەرناکات. تۆ بلّێی بە دزی ئەوەوە خۆی گەیـانـدبێتە ئـاوایی؟ نـابێ، ئەوە نـابێ. من هێنـدە کـاتە خەوتبم و ئاگام لە چوون و هاتنەوەی نەبووبێ؟!

درەنگە و کـاتی پرســــیـار و مشــــتومڕ نیە. مریەم تیلمـاســــکێ لە کەلانگوچکی خۆی و پژدێنی حەســــەن دەبڕێ، لە ملی مامزی گرێدەدات. حەسەن دەپرسێ:

- مەبەست لەوە چیە؟

+ مامز یادگاریمان دەپارێزێ.

حەسەن سەر بۆ بازەکە هەڵدەبڕێ و دەڵێ:

چیدی بەشـی تۆ ناخۆین، بە گیان قەرداری تۆم، سـەد ساڵ بژیت و نەوەت بۆ هەتایە نەبڕێتەوە.

تا لە لێژاییە ســـەختەکە هاتنە خوارەوە، حەســــەن بە قۆنداخە تفەنگ، جێ پێی خۆش دەکرد. مریەمیش پێی لە

جێی پێی وی دادەنا. تا سـواری ئەسـپەکەش بوون، مامز بە دوایانەوە بوو.

ئەســـــپەشـــــێ چی گەیاندیە ئەوێ؟ رازێکی گەورەیە، مریەم هەر هێندەی منی لێدەزانی. حەســــەنیش نەیدەگۆ، چەندی لێم دەپرسی قسەی بە لایەکیدیدا دەبرد.

گوتی:

+ لەوە گەڕێ، ئەسپ چۆن گەیشتە ئەوێ، تۆ ئەسپەکە ببەوە ئاوایی، ئێمە ئیدی ئەسپمان ناوێ.

- بەڵام تۆ بە منت نەگۆت، نیازی کوێتان هەیە؟

+ برا، بەینی خۆمان بێ، مریەم گریێەکی لە ســـــینگی هـاتووە، زۆر لێی دەترســــــم. دەبێ بیگەیەنمە شــــــار و پیشانی دختۆری بدەم.

- خۆتان دەخەنە مەترسیەوە.

+ نا، دەزانم چی دەکەم، تۆ خەمی ئێمەت نەبێ.

- بچنە هەر کوێ، هەر کێ بتانبینێ، لە رێی مریەمەوە دەتانناسێتەوە.

+ چارەی دەکەین.

– له شار چارەی هەیە، پیچەیێ بە سەر خۆیدا دەدا و تەواو. ئەدی تا دەگەیتە شار، پیچەی پێدا دەی ئەو لا لەم لا خراتر.

بە پێکەنینەوە گوتی:

دەم و چاوی لە ئارد وەردەدا.

گوتم:

کاتی گاڵتە نیە، پیاوی چاک بە، خۆ لەو ڕێیە نەدەن.

گوتی:

تۆ ترسـت نەبێ، ڕێی وا دەبینمەوە، هێ لە دۆسـتان کەس نامانبینێ. خوا بکەم نەخۆشـیەکەی مریەم شـتێکی وا نەبێت، هەر چەند ڕۆژێکە، لە بەسـتی هەنگوین، لە ئاقاری هێلانەی هەڵۆ یەکتر دەبینینەوە.

گوتم:

دەزانم چەند لاملی، بەڵام تکادەکەم لەوەیان مەیدە لاملی.

گوتی:

دڵنیا نەبم، ڕێمان بێ کێشـەیە، لە بەر خۆشـم نەبێ، لەبەر مریەم خۆمی لێ نادەم.

زۆرم لەگەڵ هەوڵدا کە ئەو نەچێتە شـــار، من مریەم دەبەم، نەهاتە رایێ. گوارەکەی دایکیم دایێ و گوتم:

بە دەستی خۆت بیدێ.

گوتی:

بە دایکم بڵێ:

خەمی من و بووکەکەی نەبێ.

بەر لە ماڵاوایی تیمکردەوە و گوتم:

حەسەن، ئەسپەکە لە سەر دڵم دەبێتە گرێ، تۆ سەری مریەم، پێمبڵێ.

گوتی:

ناهێڵم ببێتە گرێ، بەڵام بە کەسی نەڵێی.

رازەکەی بە گۆڕێ وەرکرد:

دوای نیشـــتنەوەی لافـاو، بەر لە بەســـتنی زەوی،

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

## ١٨

له هەڵـدانەوەی لاپەڕەکـانی پیری گێڕانەوە، هەر کەڕەتێ دەگەیشتیە لاپەڕەی لەدەستچوو، وەک ئەوە بوو هەموو داســـتانەکەت لەدەســـتچووبێ. زۆر جار دەهاتە ســـەرت واز لە چاپکردنی بهێنیت و هەر لە دەفتەرەکە و دوور لە چاوان بیهێڵیتەوە. وای بۆ دەچیت داسـتان بەبێ لاپەڕەی رازی ئەسپەشێ، چێژی داستانی تێدا نامێنێ و ناچێتە بەر دڵان، مینا سەربردەیەکی ئاسایی دەمێنێتەوە.

دەگەڕێیت، دەپرسیت، ئێ ئەوە خوایە کەسێ شتێ لە ئەسپەکە بزانێ. کەسێ لە پاڵ حەسەن و مریەم و هەڵۆی زەرد و مامزی چاو کەژاڵ، ناوی ئەسپەشێش بهێنێ. نیە، کەس ناوی وی نەبیســـتووە. هەموو لاوکەکان بۆ خۆت لێدەدەیتەوە، ئێ، ئەسپەکەش کەوتبێتە بەندێکەوە، نیە.

له خەوێکـدا خەونـت بە پەڕی پەڕیوەوە بینی. لەو خەونەدا رێت کەوتە ئەو کەلاوەیەی کە پیری گێڕانەوەت

تێدا دۆزیبووەوە. خشـــت و خۆڵت هەڵدەدایەوە. لەپڕ لە کونێکەوە، پەڕی پەڕیو گازیکردیت:

زوو بمگەیێ، مشک پیتەکانم دەخوات.

هەر لەو خەونەدا بە دوای گێژەلووکە راتدەکرد. پەڕە کـاخەزێ لەو کـاخەزانەی بە ئـاسـمـان کەوتبوون، هاواریکرد:

بمگرەوە، با دەمسڕێتەوە.

وەئاگادێیتەوە، بە هەناسـەی ساردەوە، پیری گێڕانەوە هەڵدەدەیتەوە و دەچیە سەر پەڕی دوای پەڕی پەڕیو.

## ١٩

نوێژیان جڵەوی ئەسپی پڕ رازم راکێشا و بەرەو دێی مریەم هەیپەم لێکرد. هەموو دەزانن ئەسپ رەوهانێکە وێنەی نابێتەوە. چەندی کردم بۆم کەمۆ نەبوو. نەیهێشت پێم بە سەر پشتی بکەوێ. لەو رۆژەوە، لەو رازەوە ئەسپەشێ لە دیدی منەوە لە دوڵدوڵ و رەخش و شەودێز و هەدبان سەرتر چوو. لە دیدی منەوە بووە ئەسپی ناو ئەفسانان.

رێم دانە رۆژێک لە خۆم دوورخستەوە. دەبوو وا بکەم، ترسام کوشتەی لیرە گومان لە ئەسپ بکات. شوێنپێی هەڵگرێ و بگاتە سەرە داوێ. بەرە بەری رۆژاوا، رۆژ هێشتا باڵێکی مابوو، لە خوار ئاوایی، لە نزیک گۆڕی بە ئاوداچووی زەردە، بە سەر شەختە لە بەست پەڕیینەوە. لەوێ ناولەپێکم لە پانایی نێکی دا و گوتم:

تۆ زوو بگەوە ئاوایی. من دوایی دێمەوە، با پێکەوە نەمانبینن.

ئەسپ لە مەبەستم تێگەیی. بە چوارپەلە و بە پێی با تێیتەقاند. هەورێکی تیری هێنا. بە سەر ئاواییدا شۆڕابەی دا. وێدەچێ بارانێکی زۆری پێوە بێ. پێم هەڵێنا، لە تاریکی و دوور لە چاوان خۆم بە ئاواییدا کرد. من گومانم لە سەر نەبوو، چاوی کەسم لە سەر نەبوو. بە حەفتە و دوو حەفتە دیار نەبام، کەس پرسیاری لێنەدەکردم. چوونکێ ماوەیەکی زۆر بوو، دابوومە دوورەپەرێزی و نەدەچوومە ماڵی کەس، نە کەس سەردانی دەکردم. زۆر پێویستی نەکردبا، نەدەهاتمە دەرێ. کەم کەس دەیبینیم. بەرایی ئەو دوورەپەرێزیەشم لە داخی مریەمەوە سەریهەڵدا. ئەو کاتەی زانیم خوشکی شیریمە و زانیم گراوی حەسەنە، هەستی نامۆیی ڕۆژ دوای ڕۆژ لە ناخم چەکەرەی دەکرد. دواتریش کە دایکم گەیشتە ئەو دنیا، تاق و تەنیا مامەوە. پتر لە خەڵک دوورکەوتمەوە و هێ لە ماڵی مریەم و حەسەن هاموشۆی کەسم نەدەکرد.

لە ئەسپەکە دەترسام ئاشکرایان بکات. خواگیرێ شوێنپێی هەڵگرێ و ماڵی هەنگەوان ببینێتەوە. هەرچەند حەسەن گوتی:

ئەگەر بشزانن لێرەین، تا ئەوان دەگەن، ئێمە ڕۆیشتووین.

خوا کردی دایکردە بارانێ، نەک هەر شوێنپێ، شەختە و بەستەڵەکیشی تواندەوە. تا درەنگانی شەو لێینەکردەوە. سەردانی دایکی حەسەنم کرد. دیاربوو بۆرژابوو، بە دەنگی من وەئاگا هات. پرسی:

+ کورم، ئەوانت دی؟ گوارەکەت دایێ؟

- دیمن، گوارەکە ئێستا بە دەستی حەسەن لە گوێی مریەمە.

+ زۆر دەترسم، چەندی زوو بیانگەیێی باشە.

- تۆ چی دەڵێی! ئەوان جێیان باشە.

+ دڵی من وا ناڵێ، پێیانبڵێ رێی خۆیان بگۆڕن.

- چیە، خەونت دیوە؟

+ نا، دڵم تریواندوویەتی.

+ دڵت هیچ نەکات، کوڕە ئەشقیاکەت دەزانێ چی دەکات.

- دڵی من وا ناڵێ، هیزە، زوو بیانگەیێ.

لەوێوە چوومە ماڵی مریەم. بابی وەک ئەوەی چاوەڕێم بکات:

+ وەرە کورم، بۆچی وا درەنگ کەوتی؟

- لای ئەوانم لێ خۆش داهـاتبوو، دەسـتم لێیـان بەرنەدەبوو.

+ کورم، چـاوت لێیـان بێ، دوژمنیـان زۆرە، بە دوایانەوەن.

- دەزانم، خەمت نەبێ.

دەستی بۆ سووچێکی ئەستێرکەکە درێژ کرد:

هۆ لەوێ چەند عانەیەک هەیە، دوایوەی من رۆیشـتم بیگەیەنە دەستی مریەم.

گوتم:

تۆ بۆ کوێ دەچی؟

هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا:

+ بۆ ئەو دنیا، من بەشم بەم دنیایەوە نەما.

- تکایە قسـەی وا مەکە، تۆ هێشـتا زۆرت بە بەرەوە ماوە.

سەری بادا و دوو سێ جار کۆخی:

واز لە دڵدانەوە بهێنە، گۆڕەکەم با بکەوێتە تەک دایکی مریەم، لای راستی.

ئەو شـــەوە لای بابی مریەم مامەوە، لە تەنیشـــتی خەوتم. تـا خەو بردمیەوە، بیرم لە کوشـــتەی مریەم دەکردەوە. لە کوشـــتن و خوێن دەکردەوە. بە خەیـاڵ مەشـــقی خەنجەر هەڵکێشـــان و راوەشـــاندنم دەکرد. بیرمدەکردەوە، یەکەم خەنجەر لە کوێی بدەم. دووەم جار بە کوێیدا راکەم. کوشـتنی وی ئاسـان بوو، بەڵام تۆ بڵێی من هێندە زاخەم تێدا بێ بیکوژم؟

من و بابی مریەم بە یەکەوە هەسـتاین. رەنگوڕووێکی گەش، من چەند رەنگی مەرگم لێ نیشـتبوو، ئەویش هەر هێندە.

گوتم:

جارێکی دی باسی ماڵاوایی و مردن مەکە.

گوتی:

لێم نابیستیەوە.

چێشـتان بوو، کوشـتەی مریەمم دیت بەرەو تەویلەی ئەسـپەشـێ دەچوو. لە سـەر دەرگە گرتم و پیلم بادا. لێی دارِسـام. ویسـتم خەنجەرەکەم هەڵکێشـم، دەسـتم لەرزی. تێگەیشتم من پیاوی پیاوکوشتن نیم. بە سەریدا نەڕاندم:

چی مـاوە بیکەی، هەردووکیـانـت دەرخواردی بەفر نەدا؟

گوتی:

وازم لێ بهێنه، کارم بەوان نیه، یەک دوو قسەم لەگەڵ ئەسپەشێ هەیە.

گوتم:

بوەستە، لە دەستم دەرناچی.

گوتی:

هێندە لە سەرم راوەستە، تا دوو قسە لەگەڵ ئەسپەشێ دەکەم. دوایی چی دەکەی، گەردنت خۆش و ئازاد بێ.

کەمێ ساردبوومەوە، دەستم شلبوو، بەرمدا. چوو دەستی لە ملی کرد، دەستی بە بژیدا دەهێنا، ماچی دەکرد، بۆنی دەکرد و دەکرووزایەوە:

وای بۆنی مریەمت لێدێ، گیانەکەم ئەوانت گەیاندە کوێ؟ جێیان گەرمە، سەرمایان نابێ؟

بەکوڵ دەگریا و لە چۆکی خۆی دەدا:

من لە خۆم خۆش نابم، چ گوناحێکی گەورەم کرد، چ ناپاکیەکم کرد، پاکنابمەوە. نە بە بەفر، نە بە ئاگر، بە هیچ پاکنابمەوە.

له ناو ئاخوڕەکه دانیشت و دەستی بە ورتەورت کرد. بە شێوەیەک دەدوا هیچی تێنەدەگەیشتم. لەپڕ هەستایەوە و بەرۆکی گرتم:

بمکوژە، پیاوی چاک بە بمکوژە، ئەگەر دەتەوێ بەهەشتت مسۆگەر بێ، نووکی خەنجەرەکەت لە سەر دڵم راکە.

گوتم:

تازە بە کوشتنی تۆ هیچ لە هیچ ناگۆڕێ.

گوتی:

دەگۆڕێ، برا دەگۆڕێ، تۆ بەهەشت وەدەستدێنی.

گوتم:

ئەو بەهەشتەم ناوێ، لە رێی خوێنی تۆوە بیگەمێ.

گریا و خۆی بە زەوی دادا، هەڵمستاندەوە و بە زۆر لە تەویلەکەم هێنایە دەرێ و رەوانەی ماڵێم کردەوە.

پشتی چەند رۆژێ بابی مریەم بە دڵی دارماڵ لە کەسەر و کۆڤانەوە گیانی سپارد. راسپاردەکەم بەجێهێنا و گەیاندمانە لای ژنەکەی و نزام خوێند کە مریەم هەرگیز خەونی لەو شێوەیە نەبینێتەوە. دایکی حەسەن حەسەنیشی مردبا، هەر هێندە شیوەنی بۆی دەکرد. ژن

و کچی ئـاوایی بەکوڵ دەگریـان. قژیـان دەڕنیەوە و سـینگیان دەکوتا. بەڵام گریان پتر بۆ حەسـەن و مریەم بوو. ئاخر هەموو پێیانوابوو مردوون و بوونەتە خۆراکی گورگ و چەقەڵان.

کوشـتەی مریەمیش لە یەکەم رۆژی پرسـە، نیشـانەی شێتایەتی لێ دەرکەوت. کەم بە ماڵ و ئاوایی دەکەوتەوە. دیتبوویان شەو لە ئەشکەفتی ئەوین دەمایەوە.

رەشـەمێ داهات، سـەرما و سـۆڵە شکا. براکان، باران و با، دڵیان نەرم بوو کە ئالەکۆکی خوشـکیان شـوو بە بەفر بکات، بەڵام دوای چی!

دایکی حەسەن گازیکردم:

دڵم هەزارە دەکـات، زۆر دەتـرسـم کوڕەکەم و بووکەکەم بە دەردی بەفر و ئالەکۆک بچن.

گوتم:

مەترسـێ، نە مریەم ئالەکۆکە، نە حەسـەن بەفر، ئەوان هەوکە لە باوەشی یەکترن.

هەر ئەو رۆژە ئەسـپەشـێ بزربوو، دڵم تریواندی، دایکی حەسەن گوتی:

کورڕم، ئەسپەشێش وەک من شتێکی زانیوە. دە بەرت مرم، تا کار لە کار نەترازاوە، شتێ بکە.

کوشــــتەی لیرەش لە ئاوایی نەمابوو، پتر ترســـــام. گزنگی نەدابوو گەیشتمە ماڵی هەنگەوان. گوتی:

دەمێکە رۆیشــتوون، ئێســـتا دەبێ گەیشــتبنە شــار و گەڕابنەوەش.

گوتم:

ئەسپەکەیان نەهاتۆتە ئێرە؟

گوتی:

نەمدیوە، بەڵام دوێنێ شـــەوێ لەو پشـــتەوە گوێم لە حیلەیێ بوو، هەو نەبووبێ!

ماینێکم لە هەنگەوان خواســـت. رۆژ زەردەی مابوو، شــارم لێ دەرکەوت. بەو شــەوە ســەردانی یەک یەک ئەو ماڵانەم کرد کە پێموابوو مێوانداری حەســەن و مریەمیان کردبێ، نەبوو. کەس نەیدیتبوون. دوو شــەو و رۆژێک بە شاردا گەڕام، سۆراخیانم نەزانی.

رۆژی دوایی بەڕێکەوتم. رێم گۆڕی، دامەوە رێی رووگە. رووە و گوندی ئەشـقیا، ئەو گوندە لە سـەردەمی ئۆسـمانی ئەشـقیای زۆر بوو، بۆیێ تا ئەو دواییەش زۆر

کەس بە ئەشقیا ناویان دەهێنا. دڵم گوتی رەنگبێ پەنایان بۆ ئەوێ بردبێ. لەوێ دوو سێ کۆنە ئەشقیام دەناسی، پێشتری لە دەستەی حەسەن بوون. پێوەندیشیان هەر مابوو. ئەشقیا کەوتۆتە ئەو دەشتەی بە پشترِێ ناسراوە، دەستی چەپی رێ، هێندەش لە رێ دوور نیە.

رۆژەکەی خۆش بوو. رەشەمێ لە سەر بارکردن بوو. زەوی چاوەڕێی خاکەلێوەیەکی کەسک لە هەموو سالان کەسکتری دەکرد. بەر لەوەی بگەمە ئەو رێچکەیەی دەتباتەوە ئەشقیا، لە بەری گردەکەوە هەندێ رەشاییم دی. هەستمکرد پەشێوییەک هەیە، شتێ قەوماوە. ئەو گردەی کەوتۆتە دەستی راست، تەواوێ لە رێ دوورە. دڵم هەزارەی کرد، نزام خوێند دووربێ لە مریەم و حەسەن. نزیکتر بوومەوە، گوێم لە حیلەی ئەسپ بوو. دیسان حیلاندیەوە، چاوم گێڕا چ ئەسپ دیار نیە. بەڵام بە حیلە ناسیمەوە، هەو بوو، ئەسپەشێی ماڵی حەسەن بوو. ئەو ئەسپە حیلەیەکی تایبەتی هەبوو، لە هیچ حیلەیێ نەدەچوو. لە ناو رەوەیێ ئەسپ و ماین حیلەی وی دەناسرایەوە.

سەری ماینم بە لای گردا سووڕاند. تاوێ راوەستام. دیتم کورپیژگەیێ رووە و من دەبەزێ، وەک گورگ راوینابێ وابوو. پرسیم:

چ بووە؟

شپرزە و شێوابوو. بە هەوکی مشت لە هەنسکەوە:

شەڕ بوو، شەڕ.

پرسیم:

کێ لەگەڵ کێ؟

گوتی:

شەڕی لەشکر و ئەشقیا.

پرسیم:

ئەشقیاکان کێ بوون؟ یەکیان ژن بوو؟

زمانی تێکئالاً، شتێکی گوت تێینەگەیشتم. لەو ساتە سەرم گێژی خوارد. دنیا لە بەر چاوم تاریک داهات. هەستمکرد بەلادادێم. هێندەم لەبیرە، کەسێک چۆتە بن پیلی برینداریێک، خوێن بە رانیدا دێتە خوارێ. بریندارەکەم ناسیەوە، کوشتەی لیرە بوو.

لە ژانی سەرم بە هۆش هاتمەوە. دەستم بۆ سەرم برد، پێچرا بوو. چاو هەڵدینم، ئێرە کوێیە؟ ئەوانە کێن؟ لە هۆدەیەکم ژن و پیاوێکی بە ساڵداچوو بە سەرمەوەن. کوڕێژگەیەکیش لە سەر دەرگا چاو سەررێژ لە خوێن

راوەستابوو، ناسیمەوە، ئەوە بوو هەواڵە گوژارکیەکەی دامێ.

تێگەیشتم ئێرە ئاوایی ئەشقیایە. کاتێ لە سەر ماینەکە بەربوومەتەوە، سەرم بە بەردێک کەوتووە و شکاوە. ئەوان پێشتری منیان دیوە و ناسیومیانەتەوە و زانیویانە هاورێی حەسەن و مریەمم، هەڵیانگرتووم و تیماریان کردووم.

## ٢٠

خولیای گوندی ئەشقیات کەوتە سەر، پیری گێڕانەوەت داخست و کەوتیە رێ. بە هۆی گردەکەوە بە ئاقاری ئەشقیا کەوتیەوە. لە راستی گردەکە لاتدا و راتگرت و دابەزییت. بە خەیاڵی خۆت شوێنەکە شوێنی راوەستانی پیری گێڕانەوە و ماینەکەیەتی. ئەو شوێنەی سەد ساڵ لەمەوبەر لێی لە هۆش خۆی چووبوو. هەستتکرد حیلەی ئەسپەشێ دێتە گوێت.

سواری ترومبێل بوویتەوە، بە دەستی چەپدا سوڕایتەوە. ئەو جادەیە هەر دەبێ ئەوە بێ کە لە سەردەمی پیری گێڕانەوە رێچکەیێ بوو. ئێرەش دەبێ ئەشقیا بێ. ئێستا ئەو ناوە لە ناو ناوان نەماوە و کەس بەو ناوە ناوی ناهێنێ. هێ لە هەندێش هیچ سیمایەکی گوندی پێوە نەماوە. لێرە و لەوێ لە کەلێنی داروباردا چەند کۆشکێکی تازە دیارن، دەوریان تەیمان و سیمبەندە. هێ لە چەند باخچەوان و پاسەوانی وێناچێ کەسیان تێدابێ. گەڕایت لە پەنای کۆشکێکی گەورەوە

شەش حەوت خانووی گچکەی هەژارانە دەرکەوتن. هەبێ نەبێ گوندی ئەشقیایە. پیاوێکی بەتەمەنت دواند:

تۆ سەربردەی حەسەن و مریەمت بیستووە؟

بە پێکەنینەوە:

مەبەستت من و ژنەکەمە؟

گوتت:

چما ئیوەش ناوتان حەسەن و مریەمە؟

گوتی:

ئەدی، لێرەوە تا دەگەیتە بەستی هەنگوین، سەد ژن و مێرد هەن بە ناوی مریەم و حەسەن.

گوتت:

من مەبەستم حەسەن و مریەمی کۆنە.

گوتی:

ئەهـــا، ئەوانەی لە بن ئەو گردەی ئەو بەر کەڵکە بەردێکیان بە ناوەوەیە.

گوتت:

بەڵێ

گوتی:

ئەگەر دەتەوێ سەربردەیان بزانی، لاوکێک هەیە کەم کەس بیستوویەتی، من هەمە. لادە پیاڵە چایەکی دەخۆینەوە و پێکەوە گوێی لێ رادەگرین. لە ناو نەوارەکاندا بە دوای حەسەن و مریەمدا دەگەڕا.

گوتت:

رەنگبێ هەر ئەو لاوکە بێ کە منیش بیستوومە.

لە مۆبایلەکەتەوە لاوکەکەت بۆی لێدایەوە.

گوتی:

خۆیەتی.

پرسیت:

هەر هێندەیان لە بارەوە دەزانی!

گوتی:

ماخرا، هێندە کەمە!

ژنەکە هەڵیدایێ:

بە خودای لاوک و حەیران جێی متمانە نین.

پرسیت:

چۆن؟

گوتی:

زۆر جار سەربردەکان دەشێوێنن. وەک خۆیان نایگێڕنەوە، زۆر شتی لێ دەپەڕێنن، شتی تێ دەخزێنن.

گوتت:

تۆ بڵێی لە حەسەن و مریەمیش وایان کردبێ؟ شتێکیان لە بارەوە دەزانی؟

گوتی:

هێندە دەزانم سەربردەی ئەوان بەو شێوە نەبووە کە لاوکەکە دەیگێڕێتەوە.

پرسیت:

ئەدی چۆن بووە؟

گوتی:

وەبیرمدێ ئەشقیایێ هەبوو. چەند شەوێ مێوانداریی ئەو دوو ئەویندارەی کردبوو. لە نزیکەوە و بە چاوی خۆیشی شەڕی سەر گردەکەی دیتبوو. گێڕانەوەی وی زۆر جیابوو لە هی ناو لاوکان. من شەوێک هەر لەو ئاواییە دیتم، حەسەن و مریەمی دەگێڕایەوە. گێڕانەوەی وی ئەشکەفتی ئەوین و بەستی هەنگوین و هەڵۆی

فریادڕەس و ئەسپی باڵداری تێدا بوو. هی وی ناپاکی و شێتبوونی دوو سێ کەسی تێدا بوو. شەڕی سەر گردەکەش شەڕی ناو لاوکەکە نیە. داخی گرانم لەبیرم نیە چۆن چۆنی حەسەن و مریەمی دەگێڕایەوە. هێندە دەزانم زۆر جیابوو لە هی ناو لاوکان. من چ باوەڕم بەو لاوک و حەیران و بەندانە نیە. هەر حەسەن و مریەم نا، کەریم و ستی، ئەسمەر و مامەر، عەدلە خان و دەروێشی عەڤدی و ئەوانیدیش وەکوو خۆیان نەگوتراونەتەوە. لۆیە لە لاوکان لە دووی حەسەن و مریەم مەگەڕێ، بێ هۆیە.

پرسیت:

ئەو ئەشقیایەی باسی دەکەیت، گەنج بوو، پیر بوو؟

ئەو کاتەی من دیم، چووبووە تەمەنەوە. ڕەنگبێ شەست و شتێ بووبێ.

گوتت:

نەتزانی چی بەسەرهات؟ کوژرا، یان خۆی رادەست کردەوە؟

گوتی:

نازانم، باوەڕناکەم خۆی رادەستکردبێتەوە. چوونکە بیستبووم ئەو سوێندی بە خوێنی سەر گردەکە خواردبوو، تا لەشی تنۆکێ خوێنی تێدا بێ، تفەنگی

ئەشـــقیایی لە شـــان نەکاتەوە. ئەوجا بە قســـەی ئەو بێ، حەسـەن و مریەمی ناو لاوکان فڕی بە سـەر حەسـەن و مریەمی راستیەوە نیە.

حەسەن گوتی:

ئەو قسـانە ناخوات، ئەوەی هەیە، حەسـەن و مریەمی ناو لاوکانە.

مریەم بە توورەییەوە:

لۆ خۆت هەر وا بڵێ.

باتدایەوە، سەرێکت لە گردی خوێن و کەڵەکە بەردەکە دا و گەڕایتەوە و چوویتەوە گژ پیری گێڕانەوە.

## ٢١

ده دوازده رۆژێ لەمەوبەر لێرەوە لە نیوەشەودا بەرەو شار کەوتنە رێ. پێرێ لە دەمی ماڵنووستنان خۆیان بە ماڵێ مەدا کردەوە. بەر لە رۆیشتن هێندە بێ واز و کز دیار بوون، بە دیتنیان کزەت لە جەرگەوە دەهات. لە هاتنەوە دڵیان هێند خۆش بوو، لە خۆشیا لێویان نەدەگەیشتەوە یەک بۆ گۆتنەوەی قسەی دختۆرەکە. گرێی سینگی مریەم شتێکی وا نەبوو جێی مەترسی بێ. وای، چۆن گەشابوونەوە، لە شێوەی گوڵ، گوڵێکی رەش، گوڵێکی زەرد. وای، چەند شیرن و جوان بوون، لە هەنگوینی رەش و زەرد دەچوون. من پێشترێ نەمدیتبوون، تەنها ناوم بیستبوون. بە دیتنیان شاگەشکە بووم. حەیف، حەیف... هەرێ وابوو، سبەی شەوێ بەرەو بەستی هەنگوین هەڵکشێن. کوێراییم دایێ، مریەم دووگیانیش بوو، دەمگۆ:

کیژم، بڵێ حەزت لە چیە؟

بە بزەی ناسکەوە:

پله، هیچ، مەگیرانی بە ماچەوە دەکەم.

خودا ناپاک و زماندڕاو بەر گوللەی جامبێزار بدات...

من ئەهـا لێرە خەوتبووم. دیتم گەلەگورگێ هـاتن، دەوری مەڕەکانمیان دا. زاریان بە شێوەیێ بەشکردبۆوە، گای پێوە دەچوو. خەنجەرم هەڵکێشـا، رامنەوەشـاندبوو، زرمەیەکی گەورە هات. لە زرمەکە وائاگا هاتم.

زۆر ترسـام، هەسـتام سـەرم بە دەرێدا داگرت، بەرەبەیان بوو. چوومە لای هۆڵی مەڕان، هیچ لە گۆڕێ نەبوو. گەڕێ بە ئاواییدا گەڕام، دنیا بێ هەست و خوست بوو. هـاتمەوە مـاڵێ، وەک خودا لە دڵی نـابم شـتێ دەقەومـێ، بە جـێ نەدەکەوتـمەوە. چـوومەوە دەرێ، هەستمڕاگرت، دەنگی دوو سێ کۆخەم بیست. دنیا کەمێ رووناکی تێکەوتبوو، چەند رەشـاییەکم دیت. دڵنیام بووم دەوری ئـاوایی گیراوە. بە پرتـاو هـاتمەوە ژۆرێ، گـازی حەسـەنم کرد، مریەم زووتر وەئاگا هات. خێرا خۆیان پێچایەوە، گوتی:

بۆ ئێمە هـاتوون، تـا زووە دەبێ دەربچین، نـابێ ئێوە تووشی کێشە بن.

گوتم:

وا مەکە، مردن و ژیانمان پێکەوە.

مریەم گوتی:

ئێمەماڵی کەس کاول ناکەین، دەڕۆین.

ئەوان دەرپەڕین و زۆری نەبردبووە تەق و هۆڕ. ئەشقیا کۆنەکانی ئێرە کە ئێستاش دڵیان بۆ ئەشقیایی لێدەدا، ئەگەر چەکیان هەبا، لە سەر ئەو دوو ئەشقیایە دەهاتنە دەنگ و ڕووداوەکە وا نەدەکەوتەوە. ئاخ، ئاخ، حەسەن هەڵەی کرد، تفەنگی بۆ مریەم پەیدا نەکرد. ئەگەر دوو تفەنگ با، شەڕەکە وا نەدەکەوتەوە. گوێم لێبوو، مریەم دەیگۆ:

چەندی زوو تفەنگێکم بۆ پەیدا بکەی، درەنگە.

حەسەن بە هێمنی:

پەلەت نەبێ، تفەنگیشت دەبێ.

مریەم سەری بادەدا:

تا دەستم دەگاتە تفەنگ، کار لە کار دەترازێ.

حەسەن:

دڵت هیچ نەکات، ئیستا تفەنگێکمان سەر و زیادە.

مریەم:

دڵم واناڵێ.

ئای لە دڵی مریەم، بەر لە ڕوودان، دەیتریواند.

کوڕیژگەکە گریـان و گێڕانەوەی لە دایـک و بـابی وەرگرتەوە. بە هەوکی پڕ هەنسـکەوە، ڕووداوەکەی ورد و باریک گێڕایەوە:

حەسـەنم زۆر خۆشـویسـت، حەزمدەکرد هەمیشـە بە دوایەوە بم. کۆڵەپشـت و فیشـەکی بۆ هەڵبگرم. لە کاتی خەوتنێ ببمە نۆبەتداری. تکام لێکرد لەگەڵ خۆیانم ببەن و منیش ببمە ئەشقیا، گوتی:

کاکۆ، هێشـتا ماوتە بەرگەی ئەشـقیایی بگری، کەمێ گەورەتر بە، هەینێ...

گوتم:

بەرگەدەگرم، تۆ فێری تەقەکردن و نیشـانشـکێنیم بکە، ئەوی دی لە سەر خۆم.

گوتی:

باشـە، ئێسـتا کەمێکت فێردەکەم، بەڵام لەگەڵ خۆمت نابەم.

تفەنگەکەی هێنا، فێری کردم چۆن فیشـەکی دەخەمە بەری، چۆن دەریدەهێنم، چۆن سـوارەدەکرێ و پەنجە

دەخەیتە سەر پەلاپیتکە، چۆن چاو بە سێرەوە دەنێیت و نیشانە دەگری.

هەرێی پێدام کە دوای دوو ساڵی دی بە ئەشقیا وەرمبگرێ و بەگەڵ خۆیم بدا. بەڵام من لە دڵی خۆم وام دانا، بە زۆریش بێ بەگەڵیان بکەوم و چاوەڕێی دوو ساڵی دی نەکەم. وای خودایە تۆ چیت بە سەر ئێمە هێنا!

خۆم پێڕانەگیرا، بە دوایاندا چووم. حەسەن تێیخوڕیم:

+ کوڕە، بگەڕێوە.

- منیش دێم.

+ دەڵێم بگەڕێوە، نەگەڕێیتەوە فیشەکێکت پێوە دەنێم.

ساردبوومەوە، ویستم بگەڕێمەوە، نەمتوانی. خۆم دواخست و بە پێدزە کەوتمە دوایان. دایانەوە دەو ئەو کەندەی خوارێ. لەوێوە تەقەیان لێکرا، رێیان گۆڕی. تەقەیان لە سەر بوو، حەسەنیش تەقەی کرد. بە قوونە شەڕ لە رێیەکە پەڕینەوە. من لەو تەنیشتەوە، تەواوێ دوور لەوان، بە پێی ئەوان غارمدەدا. چاوم لێیە، حەسەن ناوە ناوە رادەوەستێ، فیشەکێ دەتەقێنێ. گەیشتنە بن گردەکە. دنیا تەواو روونـاکبۆتەوە، لە چەند تفەنگەوە گوللەیان بۆ دەچێ. من بەو دیودا سووڕامەوە، گەیشتمە سەر گردەکە. ئەوان کەمێ لە خوار من لە ناو قۆرتێ

سەنگەریان گرتبوو. پیرانەگەیشتبوون بگەنە سەر گرد. تەماشادەکەم لەشکری سەرباز و پۆلیس لێرە و لەوێ لە سەر زگ راکشاون و تەقە دەکەن. من دەڵێم چل تۆ بڵێ پەنجا دەبوون. حەسەن ناوە ناوە فیشەکێ دەتەقێنێ. وا دیارە فیشەک بە خۆڕا نادا. ئەگەر نەشپێکێ، لە بن سەریان تۆز هەڵدەستێ و مەرگیان پیشاندەدات و دەکشێنە دواوە. شەڕ گەرمە، شەڕ تیرە و تیری تێناچێ. من خۆم داوەتە پەنای بەردێک و لە سەر زگ راکشاوم. هێندە لێیان دوورنیم. بە بەر چاومەوەن، گوێم لە قسەیان دەبێ.

مریەم دەڵێ:

ئاگادار بە، دەیانەوێ، لە پشتمان بسوورێنەوە.

حەسەن دەڵێ:

مەترسێ، ئاگادارم، هیچیان بە زیندوویێتی ناسوورێنەوە.

چاوم لێیە، ئەو چەند کەسەی نیازی سوورانەوەیان هەبوو، بە گوللەی حەسەن هاواریان لێ هەستا و کەوتن و لە سەر قوون سووڕان. کەسی دی نەوێرا خۆی تاقیبکاتەوە.

گوێم لێیە کەسـێک لە ناو لەشـکرەوە، بە دەنگێکی نێرانە گازدەکات:

حەسـەن، دەرچوونت نیە، خۆ رادەسـتکە، گیانت پارێزراو دەبێت.

بەر لەوەی حەسـەن زار هەڵێنێ، مریەم بە دەنگێک کە لە زاری هیچ ژنێکەوە نەمبیستبوو:

ئەگەر ناتانەوێ دایک و خوشک و ژنەکانتان کۆستیان بکەوێ، منـداڵەکـانتـان هەتیو بن، بە رێی خۆتـانـدا بگەڕێنەوە.

لەشکر بە رێژنەی گولله وەڵامی مریەمیان دایەوە.

حەسەن بە دەنگێک کە دار و بەردی هێنایە لەرزین:

ئێوە مەرگ هەڵیگرتوون، تاقتان لێدەبڕم، یەک لە دوای یەک دەتاننێرمە دۆزەخ.

ئـاگـام لێیە مریەم لە نـاو قۆرتەکە بە چەقۆ خۆڵ هەڵدەکەنێ و مسـت مسـت لە پێش خۆیان رۆدەکات. خۆزگەم خواست منیش لایان بم و یارمەتیان بدەم، بەڵام چۆن بکەمێ؟ لە جێی خۆم بجووڵێم، بە گوللەیێ جێم دەبێتە ئەو جێ.

تفەنگی حەسەن دوو سێ چەکداری تری پەلەواژکردەوە. بەڵام خوێن بەر چاویانی گرتووە و ناگەڕێنەوە. هەر یەکەو لە شوێنی خۆیەوە بە زمانی خۆی هەڕوگیڤ دەکات: عارەبی، تورکمانی، فەلەیی، کوردی، ئینگلیزی...

مریەم دەڵێ:

حەسەن، دەستهەڵینە، زوو زوو بتەقینە، وا نزیک دەبنەوە، ئەگەر ماندووی، تفەنگەکەتم وێدە.

حەسەن:

گیانی من، من لە شەڕ ماندوو نابم، بەڵام دەبێت دەست بە فیشەکەوە بگرم. هێندەمان نەماوە، دەبێت وا بکەم کە بە فیشەکێ دوو کەس بێخم.

وای خوایە، ئەوە من چ دەبیستم، لە کوێوە بسوورێمەوە و خۆم بگەیەنمە کوژراوێک و خەریتەی لە شان بکەمەوە و بگەڕێمەوە؟ ناکرێ، ئەوە ئەستەمە.

لە خەیاڵی دۆزینەوەی ڕێگەیەک بووم، دیتم ئەسپسوارێ لە دوورەوە باشووکەیی دێ. بە کەلێنی داراندا دەبەزێ. پێی بە زەویەوە نەماوە، باڵی گرتووە. ئەسپ حیلاندنێ حیلاندی، شەڕکەران حەپەسان. پەنجەیان لە سەر پەلاپیتکە سارد بوو. دەستیان لەرزی.

تەقە بڕا. ئەسپ گەیشتە نێوان من و حەسەن و مریەم، هێواشــــی کردەوە. بەڵام لە حیلانــدن نەکەوت. دیتم سوارەکە جۆرکێکی هەڵدایە ناو سەنگەرەکەیانەوە و باڵی گرتەوە و دیار نەما. ئەســــپەکە زەرد زەرد، لە رەنگی حەســــەن و فۆتەکەی ســــەری مریەم. پنتۆک پنتۆک رەشیشی تێدابوو، رەش رەش لە رەنگی گۆنای مریەم و کراسەکەی بەری حەسەن. سوارەکەش رەشی پۆشیبوو.

دیتم مریەم زارکی جۆرکی کردەوە و بە دەنگی بەرز:

حەسەن گیان، فیشەکە فیشەک...

حەسەن:

ئیـدی تـاقیـان لێـدەبڕم، جوانم نەدی، پێـدەچوو ئەسپەکەی خۆمان بێ.

مریەم:

نازانم، من هەر نەمدی.

ئەســپ رۆیی و تەقە دەســتیپێکردەوە. شــەڕ گەرمە، حەســەن کەم فیشــەک بە فیڕۆ دەدات. بەڵام لەشــکر بنی نایێ. وا دیارە هێزی پشــتیوانییان بۆ هاتووە. ئاگام لێیە مریەم دەیەوێ خۆی بۆ حەســــەن بکاتە چەپەر، ئەویش رایدەکێشێتەوە پشت خۆی. مریەم دەڵێ:

حەسەن گیان، من دەبێ پێش تۆ بمرم.

حەسەن دەڵێ:

گیانی من، واز لەو قسانە بهێنە، هیچمان نامرین. ببینە یەک یەک هەڵیاندەگرم، دڵنیابە قڕانیان تێدەخەم.

مریەم وازناهێنێ و هەوڵدەدات پەنای لێبکات و لە جیاتی وی گوللە بگێڕێتەوە. دیسانەوە دەنگێک لە ناو لەشکرەوە:

حەسەن:

هێشتا دەرفەت ماوە بۆ خۆ رادەستکردن، ئەوە دوا ئاگادارکردنەوەیە، خوێنی خۆتان لە ملی خۆتان:

حەسەن و مریەم پێکەوە:

نامەردینە، ئێوە نازانن هاتوونەتە شەڕی کێ، ئێرە دەبێتە گۆڕستانتان.

وای خوایە، چیت پیشانی من دا! مریەم بە لادا هات. حەسەن دەستی لە لەشی گێڕا، تەماشای ناو لەپی خۆی کرد، خوێنی دی. نەڕاندی، وەک شێری بریندار نەڕاندی. تەقەی کرد، قل قل هاواری لێ هەڵدەستاندن و پەلەوازی دەکردنەوە. بە خۆی نەوەستا، هەستایەوە، بە پێوە شەڕی کرد، هێرەی بە لەشکر کرد.

خودایە، خودای کەسی بێ کەسان، فریشتەیێ بنێرە، برینەکەی مریەم بپێچێ، هێندە خوێنەی لە بەر نەڕوات، من هیچم لە دەستنایێ.

ئای خودایە! حەسەن لاربۆوە، کەوتە سەر مریەم. تەقە وەستا. لەشکر هێواش هێواش بە پارێزەوە لە سەنگەر نزیکدەبوونەوە. من بەر چاوم تاریک بوو، هێندەی نەمابوو ببوورێمەوە. لەپڕ لە سەنگەرەوە دەنگی فیشەکێ هات. چاوم کردەوە، مریەم بوو. شەڕی کرد، وەک بڵێی ئەو نەبووبێ گوللەی وێکەوتبێ. وا دیارە نزام گیراوە و خودا فریشتەکەی ناردووە.

مریەم تەقەی کرد. بە بەر چاومەوە چوار پێنجێکی پێکا و پەلەواژیکردنەوە. لەشکر کشانەوە. لە دوورەوە سەنگەریان گرتەوە و لە چەند تفەنگێکەوە گوللە دەهات، مریەم تەقەی دەکرد و جوێنی دەدا. لەو کاتە حیلەی ئەسپەکە هات و پەیدابۆوە. ئەو جارە سوارەکەی لەگەڵ نەبوو. حیل حیلاندی و تەقە وەستا. ئەسپ تاوێ بە دیار حەسەن و مریەمەوە راوەستا، وێدەچوو بڵێ: سوار بن.

ئەوان هەست و خوستیان لە بەر بڕا. لەشکر تەقەی لە ئەسپ کرد. ئەسپ باڵی گرت و بزربوو. دەمویست خۆم بگەیەنمە ناو سەنگەر و تفەنگی بەربۆوەی دەستی مریەم هەڵگرمەوە. گوللە بواری نەدەدا. لەشکر بە

حەسەن گیان، من دەبێ پێش تۆ بمرم.

حەسەن دەڵێ:

گیانی من، واز لەو قسانە بهێنە، هیچمان نامرین. ببینە یەک یەک هەڵیاندەگرم، دڵنیابە قڕانیان تێدەخەم.

مریەم وازناهێنێ و هەوڵدەدات پەنای لێبکات و لە جیاتی وی گوللە بگێڕێتەوە. دیســـــانەوە دەنگێک لە ناو لەشکرەوە:

حەسەن:

هێشـــتا دەرفەت ماوە بۆ خۆ رادەســـتکردن، ئەوە دوا ئاگادارکردنەوەیە، خوێنی خۆتان لە ملی خۆتان:

حەسەن و مریەم پێکەوە:

نامەردینە، ئێوە نازانن هاتوونەتە شـــــەڕی کێ، ئێرە دەبێتە گۆڕستاننتان.

وای خوایە، چیت پیشـــانی من دا! مریەم بە لادا هات. حەسەن دەستی لە لەشی گێڕا، تەماشای ناو لەپی خۆی کرد، خوێنی دی. نەڕاندی، وەک شـێری بریندار نەڕاندی. تەقەی کرد، قل قل هاواری لێ هەڵدەستاندن و پەلەواژی دەکردنەوە. بە خۆی نەوەســـــتا، هەســـــتایەوە، بە پێوە شەڕی کرد، هێرەی بە لەشکر کرد.

خودایە، خودای کەسی بێ کەسان، فریشتەیێ بنێرە، برینەکەی مریەم بپێچێ، هێندە خوێنەی لە بەر نەڕوات، من هیچم لە دەستنایێ.

ئای خودایە! حەسەن لاربۆوە، کەوتە سەر مریەم. تەقە وەستا. لەشکر هێواش هێواش بە پارێزەوە لە سەنگەر نزیکدەبوونەوە. من بەر چاوم تاریک بوو، هێندەی نەمابوو ببوورێمەوە. لەپڕ لە سەنگەرەوە دەنگی فیشەکێ هات. چاوم کردەوە، مریەم بوو. شەڕی کرد، وەک بڵێی ئەو نەبووبێ گوللەی وێکەوتبێ. وا دیارە نزام گیراوە و خودا فریشتەکەی ناردووە.

مریەم تەقەی کرد. بە بەر چاومەوە چوار پێنجێکی پێکا و پەلەواژیکردنەوە. لەشکر کشانەوە. لە دوورەوە سەنگەریان گرتەوە و لە چەند تفەنگێکەوە گوللە دەهات، مریەم تەقەی دەکرد و جوێنی دەدا. لەو کاتە حیلەی ئەسپەکە هات و پەیدابۆوە. ئەو جارە سوارەکەی لەگەڵ نەبوو. حیل حیلاندی و تەقە وەستا. ئەسپ تاوێ بە دیار حەسەن و مریەمەوە راوەستا، وێدەچوو بڵێ: سوار بن.

ئەوان هەست و خوستیان لە بەر بڕا. لەشکر تەقەی لە ئەسپ کرد. ئەسپ باڵی گرت و بزربوو. دەمویست خۆم بگەیەنمە ناو سەنگەر و تفەنگی بەربۆوەی دەستی مریەم هەڵگرمەوە. گوللە بواری نەدەدا. لەشکر بە

تەقەکردن و پارێزەوە گەیشـــتنە نـاو ســـەنگەر، پیلی حەسەن و مریەمیان راکێشا، ئەوان گیانیان لە بەر مابوو. گوێم لێبوو گازی یەکتریان دەکرد:

حەسەن، حەسەن...

مریەم، مریەم...

من حەپەســـابووم، نەمدەتوانی هەســـتمەوە. پێم گۆد بووبوو، زارم شـــکا بوو، چاوم هیچی نەدەدی. نـازانم چەندی پێچوو، پێم جوولەی تێکەوت. خۆم غلۆرکردەوە و گەیشتمە ناو سەنگەرە خوێناویەکەی حەسەن و مریەم. دیتم تفەنگەکەی حەســـەن هەر لەوێیە، دیاربوو، لەبیریان چووبوو بیبەن. هەوریەکەشی بەجێمابوو. هەڵمگرتنەوە و شـۆڕبوومەوە. بە ناو خوێنی لەشـکردا گەیشـتمەوە سـەر رێ، ئەوە بوو، لەوێ تووشی تۆ بووم.

کوڕیژگە بە کول گریا و گوتی:

من هەر دەبێ تۆڵەی ئەوان بکەمەوە.

گوتم:

لەشکرێکیش کوشتوبڕ بکەی، تۆڵەی ئەوان ناکرێتەوە، جێی ئەوان بە هیچ پڕنابێتەوە.

ژنەکە بە گریانەوە:

ئێوە چی دەڵێن! دڵم دەڵێ ئەوان نامرن و دەگەڕێنەوە. منداڵەکەیان دەبێ و لە باوەشی دەگرن.

بەیانی دابوو نەدابوو، کەوتمە ڕێ. کوڕێژگە زۆر کۆشا لەگەڵ خۆمی ببەم، نەمبرد. نیوەڕۆ گەیشتمە شار. لە هەندێ گەڕەک دەنگی شین و ڕۆڕۆ دەهات. هەر کەسە و سەردوولکەی بە کەسێکدا هەڵدەگۆ. بەڵام دەنگی (حەسەن ڕۆ، مریەم ڕۆ) هەموو شیوەنەکانی داپۆشیبوو. ماینەکەم بردە خانێک و چوومە بەر دەم سەرا. خەستەخانەکەش لە نزیکە وێ بوو. ئەو ناوە خامۆش، بۆنی خوێنی لێدەهات. سەرێکم بە خەستەخانەدا داگرت. جمەی دەهات لە بریندار. دیار بوو هەموویان برینداری شەڕەکەی دوێنێ بوون. زۆر چاوم گێڕا، حەسەن و مریەمم نەدیتەوە. کوشتەی لیرەشم بەر چاو نەکەوت.

لە بەر دەرگا دوو سێ ژن بە چپە لە کوژراو و بریندار دەدوان:

- سی کوژراو و حەڤدە بریندار.

- نا کچێ، حەڤدە کوژراو.

- وا نیە، کوژراو زۆر زیاترە لە بریندار، زۆریان خەڵکی ئێرە نەبوون، بردنیانەوە.

- کچێ دەڵێن حەســـەن و مریەم نەمردوون، پۆلیس بردوویانن.

- نا، ئەو تەرمانەی شـــەوێ ناشـــتیانن، دووانیان حەسەن و مریەم بوون.

- بە چی دەزانی؟

+ من دەمێدی چوومە گۆڕستان، لە پەرگەی گۆڕستان دوو گۆڕی تازەم دی، وابزانم گۆڕی ئەوانن.

- باوەڕناکەم، لەگینە بۆ تێبزرکردن بێ.

- وای بە گۆریی گۆڕیـــان بم، چـــاوی حوکمەتیـــان شکاند.

- بەر نەفرەتی خودا بکەون، چۆن دڵیان هات ئەو دوو ئەویندارە، ئەو دوو عەگیدە لە خوێن بگەوزێنن.

گریام، زۆر گریام. رێی گۆڕستانم گرتە بەر. دوو سێ پۆلیس لە نێو خۆیان باســـی شـــەڕەکەی دوێنێیان دەکرد. یەکیان دەیگوت:

چەندمـان لێ کوژرا و بریندار بوو، گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە، ئەشقیا نەما، تۆویان بڕایەوە،

لە گۆڕستان نزیکبوومەوە. پیاوێ لە پێشم دەڕۆیشت، بە رۆیین نـــاســـــیمەوە. گـــازمکرد، هەو بوو، بـــارامی

هەنگەوان. باوەشـــمـان پێکدا کرد، تـا مـاوەیەک لە بەر گریان هیچمان زارمان نەگەڕا. گەیشتینە سەر دوو گۆڕە تازەکە، پرسیم:

دەبێ گۆڕی ئەوان بن؟

گوتی:

بڵێم چی، وێدەچێ.

گوتم:

بیستم ئەوان نەمردوون.

گوتی:

منیش وام بیســـتووە، نازانم، وا چاکە شـــەو بێین و گۆڕێکیان هەڵدەینەوە تا پێبکەوین.

گوتم:

وا دەکەین.

من ورد و بـاریـک گێڕانەوەی کورپێژگەکەی گونـدی ئەشقیام بۆی گێڕایەوە، ئەویش گوتی:

دوێنێ لە کاتی هێنانەوەی تەرم و بریندارەکان من لە نزیـک ســـەرا بووم. پۆلیس ئەو نـاوەیـان دەور دابوو، نەیاندەهێشت کەس لێیان نزیکبەوێتەوە. پێموابێ ژمارەی

برینـدار و کوژراو خۆی لە حەفتـا دەدا. من ســــەرەتـا نەمزانی ئەو شــەڕە لەگەڵ حەســەن و مریەم بووە. دەنا خۆشــــــم لەســەر دانابا، دەبوو پێبکەوم داخوا ئەوانیان لەگەڵە یان نا. حەیف درەنگ زانیم.

شــــەو درەنگانیش کە دە دوازدە تەرمیان هێنابووە گۆڕستان، من فریانەکەوتم. تا گەیشتمێ ناشتبوونیان.

گوتم:

ئەگەر نەشــمانتوانی گۆڕەکانیان هەڵدەینەوە، ئەو یەک دوو رۆژە خۆمان لە گۆڕستان دەگرین و پێدەکەوین.

گوتی:

هەنــدێ لە کوژراوەکــان هی ئێرە نین و لێرەیــان ناشـــتوون. هێ لە هەندێ، ســبەی هەرچی ژنی شـــارە دەڕژێنە ســــەر ئەو دوو گۆڕە، ئـاخر ئەوان بە گۆڕی حەسەن و مریەمی تێدەگەن.

ئێمە لەو قســانە بووین، کوڕیژگەی خۆمان پەیدا بوو. خۆی بە گۆڕەکاندا دادا، هەر جارەی ئامێزی لە یەکیان وەردەهێنا و بۆنی دەکردن و دەگریا. لە هیکڕا هەستایەوە و گوتی:

حەســەن و مریەم لێرە نین، ئەو گۆڕانە بۆنی ئەوانیان لێ نایە. نا، لێرە نین، ئەوان زیندوون، دەبێ بیانبینینەوە.

کورپێژگەمـان لە ئـامێزگرت و دڵمـان دایەوە، کەڵکی نەبوو، سووربوو لە سەر قسەی خۆی:

باوەڕبکەن، حەسەن و مریەم لێرە نین.

پرسیم:

بە چی دەزانی؟

گوتی:

دڵم وا دەڵێ، دە ئێوە بۆنیـان بکەن، بۆنی حەســـەن ناناســـنەوە؟! من دەڕۆم، کارێک هەیە دەبێ بیکەم، دوایی دەچمەوە لای حەسەن و مریەم، وا لە سەر گردەکەن.

وەک پەلیک دەرپەڕی.

بە دوایدا چووین، لە ســەرە کۆڵانێ لە ســەر کۆسـپێ راوەستا، بە دەنگی بەرز:

خەڵکینە، وەرنە دەرێ، حەســـەن و مریەمتـان بۆ دەگێڕمەوە.

زۆری نەبرد ژن و منـداڵ لە دەوری خڕبوونەوە، دەستیپێکرد:

حەســـەن و مریەم، دوو ئەوینـدارەکەی بەســـتی هەنگوین، دوو قارەمانەکەی گردەکەی ئەوبەری گوندی ئەشقیا...

به کورتی و به پوختی ئەوین و نەبەردیی ئەوانی گێڕاوە، ڕۆیشـــت. ئێمە لە دوای نەبوونەوە، لە ســـەرە کۆلانێکی دی ڕاوەســـتا و دیســـان ژن و منداڵی لە خۆی خڕکردەوە، داســـتانەکەی بۆ گێڕانەوە. لەوێشـــەوە بۆ گەڕەکێک و ســـەرە کۆلانێکی دی و گێڕانەوەیەکیدی. لە گێڕانەوەشدا بەستی هەنگوین و گردی خوێنی چەند پاتە دەکردەوە. وا بزانم لە شـەشـەم کەڕەتی گێڕانەوە پۆلیس پێیـانزانی، هـاتن و ڕاویـاننـا. بە دەم هەڵاتنەوە، یەک بە دەنگی خۆی:

حەسەن نەمردووە، دەگەڕێتەوە بۆ گیانتان.

من و بارامی هەنگەوان شـــەو لە گەڕەکی جووان لە ماڵی دۆسـتێکمان ماینەوە، مووشـێی ناو بوو. نەخشـەی گۆڕهەڵدانەوەمـان دەکێشـــــا، کچە پـارچەڵەی مـاڵەکە گێڕایەوە:

دوای هێنانەوەی تەرم و بریندارەکان، بە چاوی خۆم دیتم، ئەسپێک وا تێبگەم زەرد بوو، لە دەوری سەرا وەک فرفرۆکە دەسووڕایەوە. هێند تیژ دەسووڕایەوە و دەست و پێت نەدەدی. نازانم سـواری لە سـەر بوو یان نا، ناوە ناوە دەهاتە سـەر پاشـوو و دەیحیلاند، حیلاندنێ لەرزی خسـتبووە دڵی پۆلیسـەکان و دەسـتەوەسـتان مابوون. خۆی کرد بە ژۆرێدا، زۆری پێنەچوو هـاتە دەرێ. دوو

کەسی لە سەر پشت بوو. روخسارییانم نەدی، بەڵام بە حەسەن و مریەم دەچوون. ئەسپ وەک ئەوەی باڵی لێ روابێ، وندابوو.

دایکی گوتی:

منیش گوێم لە حیلەی ئەسپێک بوو، هەبێ نەبێ ئەو ژن و پیاوە حەسەن و مریەم بوونە.

بابی گوتی:

واز لەو ورێنانە بهێنن.

کچە گوتی:

ورێنەی چی، بەو دوو چاوەی خۆم دیم، ئەسپ دوو کەسی هەڵگرت و وەک ئەوەی بفڕێ، وا بوو.

گۆتمە کچە:

تۆ پێشتر حەسەن و مریەمت دیبوو؟

کچە سەیری داک و بابی کرد و هیچی نەگوت، دایکی گوتی:

ئا، ئەوان لەو شەوانە یەک دوو شەو لە ماڵێ مە مانەوە.

باب رووی لە من کرد:

ئەو رۆژە کە پێتمگوت نەمدیون. لە بەر سوێندەکە بوو، چوونکێ حەسەن بە تەورات سوێندی دابووم لای هیچ کەسێ، ئەو کەسە چاویشم بێ، نەڵێم ئەوان لێرەن.

کچە دەستی لە بەرکی کەوێکەی راکرد، نەینۆکێکی دەرهێنا:

ئەوە نەینۆکی حەسەنە، لێی بەجێما. ها، بیدەوە حەسەن.

لێم وەرگرت، لێی وردبوومەوە، رەنگبێ هەو بێ. خۆدیکێکی لەو شێوەم بە دەستی حەسەنەوە دیتبوو، هەو بوو، دیاریی مریەم بوو. چەند جارێ گوێم لێی بووە دەیگۆ:

لە هەر کوێ بم، روو لە رۆژێ رایگرم،

مریەمی تێدا دەبریسکێتەوە.

خۆدیکی حەسەنم تا ئێستا پاراستووە. منیش هەر کاتێ روو لە رۆژێ رایدەگرم، مریەم و حەسەنی تێدا دەبینم. هەر هێندەش نا، لەو خۆدیکەوە سەربردەی ئەوانم جوانتر و روونتر وەبیردێتەوە.

شەو درەنگ بە دوو خاکەناسەوە، بە پێدزە و پارێزەوە، بەرەو گۆرستان چووین. حەسحەس وەک

چاویەشە دەگەڕێن، تفەنگ لە شان و دۆنکی بە دەستەوە، بواریان نەدا بگەینە گۆڕستان.

هەڵدانەوەی گۆڕمان بۆ شەوی دوایی هەڵگرت.

## ٢٢

تۆش گێڕانەوەی پیری گێڕانەوە بۆ شـــەوێکی دی هەڵدەگریت.. ئێســـتا دەچیت ســـەرێ لە هەندێ شـــوێن دەدەیتەوە، شوێنی داستانەکە.

ئەوە سەراکەی سەد ساڵ لەمەوبەر، لە سەر تەرزی جارانی نوێکراوەتەوە. ئێرێهێش شوێنی خەستەخانەکەیە. دەچیە خەیاڵێکی قووڵەوە. کوژراو و برینداارانی دەســـتی حەسـەن و مریەم دەبینیت. حیلەی ئەسپەشـی دێ، چەند کەڕەتێ بە دەوری سەرادا دەسووڕێتەوە و باڵدەگرێ.

هەســـتدەکەیت پیری گێڕانەوە لەو کۆڵانەوە بەرەو گۆڕســـتان رۆیشـــتووە، تۆش بێرەدا دەچیت. ســـەرێ لە ســـێ گۆڕە کۆنەکە دەدەیت. هەو بن و هەو نەبن، تۆ بە گۆڕی حەســــەن و مریەم و پیری گێڕانەوەیان دەزانیت. لەوێوە لە جادەکە دەپەڕیەوە. لەو گەڕەکە کۆنە کە بە خشـتی دیوارە داڕزاوەکانی دیارە تەمەنی داسـتانەکەیان هەیە و هەنـدێکیـان زۆر لەویش بەتەمەنترن، لێرە وەک

بڵێی گوێت لە دەنگی کوڕێژگەی نـاو داســـتـانەکەیە و حەسەن و مریەم دەگێڕێتەوە.

سوار دەبێت و دەڕۆیت. لە بن گردی خوێن دادەبەزێت و بە پێیان ســـەردەکەوێت. گردێکی رووت، بنە دارێکی پێوە نیە. ئەوەی ماوە کەڵەکە بەردەکەیە و ئێســتاش هەر ناوی حەسەن و مریەمە. لە بەردەکانەوە وێنەیێ دەبینێت، هەستدەکەێت حەسەن و مریەمن. باوەشیان پێکداکردووە و خـوێـنـیـان لـێـوە دەچـۆڕێ. کـوڕێـژگەیەکـیـش لە تەنیشــتیانەوە بە چاوی پڕ فرمێســکەوە لێیان دەڕوانێ. لێرەش حیلەی ئەســپەکە دێ. ســـەر هەڵدەبڕێت پەلە هەورێ کە شـێوەی ئەســپی گرتووە، با رووە و بەسـتی هەنگوین دەیهاژوا.

لە گردی خوێن دێتە خوارێ. ســـواردەبێـت و بە تەنیشـــت گوندی ئەشـــقیا، رێی پەلە هەورەکە دەگرێت. دەگەیتەوە هەنگەوان، لەوێوە بۆ ســـەر تاتەبەردی دیدار. بیری هەڵۆ زەردەکە دەکەیت، بیری وێنەکانی حەســەن و مریەمی ناو ئەشکەفتی ئەوین دەکەیت.

لە ســـەر تاتەبەرد دادەنیشـــێت و چاو لە گۆماوەکە دەبڕێـت. رەشـــاییەکە دەردەکەوێتەوە. ســـەر بەرز دەکەیتەوە و چاوەڕێیت لە ئەشـــکەوتی ئەوین و هێلانەی هەڵـــۆوە، هەڵــۆ زەردەکە دەرکەوێـــتەوە، دەرنەکەوت.

جارێکی دی تا بیســـتت ژماردەوە، رەشــــایی ناو گۆم نەبۆوە هەڵۆکەی دوندەکە. سەیرە!

شوانەکە پەیدابۆوە، گوتی:

+ دیسان بۆ دیتنی ئەشکەفتەکە نەهاتبی!

- با.

+ چیدی نایبینیەوە. دوێنی ئەو دەمانە، دەســـــتەیێ لاوی ریشـــداری بەر ســـمێڵ هەڵقاچراو، نازانم تیئێنتی بوو چ بوو، لە نـاویـان دانـایەوە و تەقـانـدیـانەوە. زرمەیەکی لێوەهات، ســەرانســەری ئەو بەســتەی لەرزاند. لە هەموو بەرزاییەکانەوە خۆڵ و بەرد هاتنەوە خوارەوە. ئەشکەفت شوێنەواریشی نەما. ئەها تەماشاکە، خۆ لێرەوەش دیارە چی بە سەر هاتووە.

+ تۆ بە راستتە؟

- ئا، ئەوانە گوتبوویان ئەو ئەشکەفتە پەرستگای گاورانە و شەیتان تێیدا دادەنیشی، نابێ بمێنێ.

وا دیارە ئێرەشــیان بە دەردی پەیکەرەکانی کێوی بامیان بردووە.

بە باسـکەکەدا سـەرکەوتیت و بە چاوی خۆت دیتت، ئەشـکەفتی ئەوین، هێلانەی هەڵۆ، هەر پارچە بەردێکیان کەوتۆتە سەر باسک و ناو دۆڵێ.

دەبینیت هەڵۆ زەردەکە، لە سـەر دوندەکەی ئەولاتر دەسـووڕێتەوە. وێدەچێ بە دوای شـوێنێکدا بگەڕێ تا هێلانەی لێ چێبکات. بەڵام لەو ناوە کوا شـوێنێکی وا شایەستەی ئەو بێ.

بە نەمانی ئەشـکەفتی ئەوین و هێلانەی هەڵۆ زۆر نیگەران و دڵتەنگ بوویت، بۆ تاوێ وات هەسـتکرد داسـتانی بەسـتی هەنگوینت لەدەسـتچووە. لە ناو ئەو کەرتکە شـاخە وردوخاشـبووانە هێسـکوپرووسـکی حەسەن و مریەمت دی، مەرگی ئەوینت دی.

ئیدی حەزی گەڕانت بە شـوێنی روودانی داسـتانەکە نەما. دەگەڕێیتەوە و دوا لاپەڕەکانی پیری گێڕانەوە دەخوێنیتەوە و...

## ٢٣

لەوەتەی ئۆسمانی بارگە و بنەی تێکناوە و ئینگلیز لە شوێنی هەڵیداوە، ڕووداوی لەم شێوە لەم شارە ڕووینەداوە. لە ڕۆژێکدا و لە شەڕێکدا هێندە بریندار و کوژراوەی لە پۆلیس و سەرباز بۆ بێتەوە، بە دەستی کێش؟ دوو ئەشقیا. شار پێیوابوو دوای نەمانی ئۆسمانی و هاتنی ئینگلیز ئەشقیا نەماوە، مابێتیش بە کێو و دەشتەوەن، هێندە لە شار نزیکنابنەوە.

سەری زار و بنی زار حەسەن و مریەمە، ئەویندارى و قارەمانێتی حەسەن و مریەمە. باس هەر باسی بەستی هەنگوین و ئەشکەفتی ئەوین و هەڵۆی زەرد و ئەسپەشێ و گردی خوێنە. لەمەڕ بزربوونی حەسەن و مریەمەوە هەر کەسە و شتێ دەڵێ:

- بە قارەمانێتی مردن.

- مردنی وا بەدەستی کێ دەکەوێ، خۆزگەم بە خۆیان.

- حەسەن هی ئەوە نەبوو وا بە داوەوە بێ. هەبێ نەبێ ناپاکیی لێکراوە.

- هەرچی قارەمان هەیە، کوشتنەکەی دەستی ناپاکێکی لە پشت بووە.

- مریەم مریەم، دەڵێن شـەڕێکی کردووە، لە مێژووی هیچ میللەتێک وێنەی ژنی وا نەبووە. تا دوا هەناسـە پەنجەی بە سەر پەلاپیتکەی تفەنگەوە بووە.

- بە راستی ئەوە لە پەرجوو دەچێ، کە کەچە تفەنگێ شەڕی سەد تفەنگ بکات و نیوەیان پتر...

- من باوەڕناکەم حەسـەن و مریەم مردبن. هەیە دیویەتی ئەسـپێک هاتووە، لە ناو سـەراوە ئەوانی هەڵگرتووە.

- منیش دەڵێم نەمردوون، بیسـتم گەیشـتوونەتەوە بەستی هەنگوین.

- ئەدی ئەو دوو گۆڕە تازەیەی گۆڕسـتان کێن؟ وا ژن دەچنە سەری و شینی حەسەن و مریەم دەکەن.

- کێ دەڵێ گۆڕی ئەوانن؟ کێ بە چاوی خۆی دیتی، تەرمی ئەوان شۆڕکەنەوە ناویان و...

- نازانم، رازێک لەوەدا هەیە.

تۆ بڕوانە ئاسمان، لە لوولەی منارەوە کۆترەشینکە لە شـێوەی دووکەڵ بەری ئاسـمانیان گرتووە. بە سـەر

قەڵاتی قەتارەیان بەستووە. لەوێوە بۆ سەر گۆڕستان، بە دەم فڕینەوە گمەگمی دەکەن، لە شـــین و گریان دەچی. لەوی لە شــێوەی چەند پەلە هەورێکی تەنکی دەم با، دەمی ئــاوێزانی یەکتر دەبن، دەمی کەمی لێکدی دووردەکەونەوە.

لەگەڵ بارامی هەنگەوان بەرەو گۆڕســـتان بووینەوە. وای، دەڵێی هەرچی رەشــۆڵەی ئــاســمانە لێرە نیشتوونەتەوە. گۆڕستان لە ژن رەشدەچێتەوە. ژنی شار بە موســڵمان و جوو و فەلە و ئێزیدی و یارسانەوە بە دەوری دوو گۆڕەکە کە ئەگەر هی ئەوان بن، سێ کەسی تێدا نێژراوە، بازنەی شینیان بەستووە. ژنی سەردوولکە دەڵی، دەنگ و ئاوازێکی هەیە، هەبێ نەبێ لە شمشاڵەکەی کوشتەی مریەمی خواستووە. گۆڕستانی ژن بە جۆری سینگ دەکوتن، سوێندبخۆی لێت ناکەوی، سینەکوتان نیە و دەفلێدانە. ژنانی ســینە دەف، بە ئاوازی دەفانە، ســـەربەندەکەی بۆ دەگێڕنەوە. کۆترەکانیش گمەگمیان دەگۆڕی. وەک بڵێی لاســایی ژنان بکەنەوە، باڵیشــیان لە سەر ئاوازەی سینەکوتانی ژنان لێکدەدا:

**بەستی هەنگینم بە داروبارە**

**جێی سوارچاکان و جێی ئەویندارە**

لەهیکەوە دەنگێک زۆر لە دەنگی مریەم دەچوو:

هێی ژنینه، سەر بەشینینه، ئەو شینه راگرن. ئەگەر حەزتان لە شینه، شینی خۆتان بگێڕن، نەک هی حەسەن و مریەم. ئەوان زیندین، ئێستا گەیشتوونەتەوە بەستی هەنگین. من بەو دوو چاوەی خۆم دیم، لە سەر پشتی ئەسپێکی زەردبوون. ئەسپ باڵیگرت، لە بژ و کلکیەوە چەند دڵۆپە خوێنێکی داباراند. حەسەن و مریەم نەمردوون، بریندارن، برینیشیان سووکە.

ناو گۆڕستان بە وێنەی بن گۆڕستان، کپ بوو. کۆترەکانیش لە گمەگم کەوتن. ئێمە زۆر چاومان گێڕا، ژنەکەمان نەدیت. نەمانزانی لە کوێوە قسە دەکات. زۆری نەبرد، سەردوولکە و سینەکوتان دەستیپێکردەوە.

هێی، پەنجا ساڵ بە سەر دیمەنی شینی کۆتری شینی ئاسمان و ژنانی رەشپۆشی سەر گۆڕستان تێدەپەڕێ، ئێستاش گمەی ئاسمان و سەربەندی سەردوولکەی ژنانم لە گوێدا دەزرینگێتەوە.

سەردوولکە درێژ بوو، درێژتر لە قەتارەی کۆتران. لێ حەیف، تەنها سەربەندم لە بیرماوە. نەدەبوو ئەو سەردوولکەیە لەبیربچێتەوە. شاری لە گوندی زووتر شتیان لەبیردەچێتەوە.

ســـەردوولکە جەرگبڕ بوو. بەردی دەتواندەوە، چاوی میرغەزەبیشـی پڕ ڕۆندک دەکرد. هەسـتمکرد، کوکوختی و کۆترەکانیش لەگەڵ ژنان بە زمانی خۆیان دەیلێنەوە.

لە گەرمەی ســـەردوولکە و ســـینەکوتانەوە، ژنێک بە دەنگێک کە زۆر لە دەنگی دایکی حەسەن دەچوو:

تەخت و تاراجتان وەرگەڕێ. خودا هەڵیناگرێ، ســـێ کەستان لە دوو گۆڕ ناشتووە.

هەنگەوان بە سەرسوڕمانەوە:

سێ کەس و دوو گۆڕ!

گوتم:

نەتبیستووە، مریەم دووگیان بووە؟

تێر گریاین و گەڕاینەوە، هەنگەوان گوتی:

ڕەنگبێ ئەو هەموو فرمێســـک و ڕۆڕۆیە لێرە بەلاش بڕوات و قســـەی کوڕێژگەکە راســـت بێ و حەســـەن و مریەم لێرە نەبن.

گوتم:

ئەوشۆ خۆشمان لەسەر دانابێ، پێدەکەوین.

شـەو لە سـێ باری نیوە شـەوێ خاکەناسـمان لە بن سـاقۆ شـاردەوە و هاتین. نەگەیشـتبووینە سـەر کەندی لای پردەکە، سێ چوار تەقە کرا. زۆری نەبرد لە ئاسمانێ گوللە بە گوللە دەکەوت. بە پڕتاو گەڕاینەوە. تا کەڵەباب و مەلای بەیانیش بانگیاندا، ناوە ناوە گوێمان لە تەقەیێ دەبوو. تا رۆژ بۆوە، ئێمە لە سـەر ئاو و ئاگر بووین، داخوا چی قەومابێ.

کچی ماڵەکە گوتی:

نەمگوت حەسـەن و مریەم زیندوون. دڵنیام ئەوان بوون بە سەر شاریان داداوە.

بابی لەسەرخۆ لە بن گوێم گوتی:

گوڵنیشـانی کچم لەسـەرخۆی نیە. لەو رۆژەوەی مریەمی دیوە، هۆشـی لەدەسـتداوە. رۆژێ چەند جارێ دەچێتە کنێسـت و دەکەوێتە نزا و پاڕانەوە: خودایە، خودای گەورە، من رەنگی خۆم نـاوێ، بیگۆڕە، رەش رەشـی بکە، لە رەنگی گۆنا جوانەکانی مریەم. خودایە، وێنەی مریەم جوان و شیرینم بکە.

زۆر خەمی کچەکەمە، دەچێ رووی لە رەشـکـاو هەڵدێنێ، تەنی لێ دەدات و دەچێتە بەر ئـاوێنە. دەبینێ رەنگی مریەمی نەگرتووە، دەست لە تیتکی خۆی دەنێ و هاوار دەکات:

به من بڵێن چۆن ڕەنگی مریەمم لێ دەنیشێ؟

نازانم چی لەو کچەم بکەم، زۆر خەمی لێ دەخۆم.

گوتم:

خەمی ناوێ، چا دەبێ. ئەوە تەنها دەردی کچەکەی تۆ نیە. هەر کچێ بۆ یەکەم جار مریەم دەبینێ، تووشـی ئەو دەردە دەبێ. ئەو حەزەی لە دڵ چەکەرە دەکات. دوایی بەرە بەرە لەبیردەکات و ئاسـایی دەبێتەوە. خەمی لێ مەخۆ.

لە کۆڵانێش ژن دەیانگوت:

هەو بوون، حەسەن و مریەم بوون.

درەنگ لە زاری پۆلیسـێکەوە کە ئەو شـەوە یەکێک بووە لە نۆبەتدارانی سەرا، هەواڵەکە کەوتە سەر زاران و زار لە زاری دەگێڕایەوە:

ئەسپسـوارێ لە تاریکیەوە هات. تەقەی کرد، تەقەمان لێکرد. حەفت کەسـی لە ئێمە خەڵتانی خوێن کرد و لە تاریکی بزر بوو.

ئیدی سـەرباز و هەیتە ڕژانە شـار و شـەو و ڕۆژ لە سـەرە کۆڵانان دەست بە تفەنگ ڕادەوەستان. شەو کەس بۆی نەبوو ماڵە و ماڵ بکات. ڕێی گۆڕسـتانیشـیان

داخســـــت. پێنەکەوتین داخوا دوو گۆڕەکە حەســـەن و مریەمن یان نا. کەوتنە گرتن و دەســـــتبەســـــەرداگرتنی ئەسپ و ماین.

هەنگەوان گوتی:

میرزا، بیســـتوومە کوشـــتەی لیرە برینەکەی ســـووک بووە و گەیشتۆتەوە ماڵێ، من دەڕۆم. حەســەن و مریەم نەبینمەوە، یان من دەبم یان ئەو. خۆم لەســـــەر دانابێ، نابێ خوێنی ئەوان بزربێ.

ویستم بیوەستێنم، نەوەستا و ڕۆیشت.

منیش ســــەر لە ئێوارە ماڵاواییم لە خانەخوێ کرد. کچەکەی کە روخساری بە تەنی سواخ دابوو، گوتی:

توخدا ئەگەر مریەمت دیتەوە، کەمێ لە رەنگی ویم بۆ بهێنە.

گوتم:

باشە، بەڵام تۆ لە مریەمیش جوانتری.

گوتی:

یەک کەس هەیە لە مریەم جوانتر.

گوتم:

وایە، ئەویش تۆی.

گوتی:

نا، خودا.

خۆدیکەکەم بۆی راگرت و گوتم:

با جارێ هەر لای تۆ بێ.

وەرینەگرت و گوتی:

نا، بیدەوە حەسەن، تۆ زووتر دەیانبینیەوە.

خۆم گەیاندە خانەکە و سوار ماین بووم، هەرچۆنێ بوو لە شار دەرچووم.

گەیشتمەوە گردی خوێن. تۆ بڕوانە بەرد نیە، بنە دار نیە، گوللە نەیسمیبێ، نەیقرنجاندبێ، پەڵەی خوێنی پێوە نەبێ. لە سەنگەرەکەی حەسەن و مریەم بەژنێ بەرد کەڵەکە کراوە. هەندێ لە بەردەکانیش خوێنیان پێوە. ئەو بەردەشم دیتەوە کە کوڕیژگەی گۆرین خۆی دابووە پەنای و لەوێوە دیمەنی شەڕەکەی لە بینایی خۆی پاراستبوو. پەڕیمەوە بەری ئەشقیا و سەردانی ماڵی کوڕیژگەکەم کرد. دایکی سینگی خۆی دەکوتا و بە کوڵ دەگریا. بابی پرسی:

+ ئەو ئەسپسوارەی شەو لە شار حەفت جەندرمەی کوشت، زانیت کێ بوو؟

- نا.

+ حەسەن بوو، بەر لە هاتنی تۆ بەرەو بەستی هەنگوین ئاوزینگی لێدا و گوتی: نابێ ولات بێ ئەشقیا بێ.

- حەسەن! مریەمیشی لەگەڵ بوو؟

+ نا، بە تەنێ بوو.

- بە تەنێ!

+ تەنێ تفەنگ و ئەسپ و هەوریەکەی وی لەگەڵ بوو. سوارەکە حەسەنی مریەم نا، حەسەنی من بوو. کوڕەکەمان ئەوڕۆ ناوی لە خۆی نا حەسەن و رووەو بەستی هەنگوین مینا تیر دەرچوو.

---

هەولێر

خاکەلێوەی ٢٠٢١ - رەشەمێی ٢٠٢٢

سوپاس بۆ:

قەرەنی جەمیل

کەژاڵ حەمە

گوڵێ سەلیم

سەرکەوت وەلی

هەر یەکەیان بە رەنگێ رەنگیان بە سەر کتێبەکەوەیە.

## وشەدان

ئاوگەلە: ئاژەلی لە مێگەل دابڕاو.

بالۆرە: ئاوازێکی کچانەیە، بە لێدان و لێخشـانی پشـتی بەنجە بە هەوکدا، لە زارەوە دەردەچێ.

بامیان: دۆڵێکە لە ناوچەی هەزارستانی ئەڤگانستان، پەیکەری بۆدای لێبوو، تالیبان تەقاندییەوە.

پووشی کورتان: پووشە نەرمە، پووشی لاسک باریکی درێژە، کورتانی لێ چێدەکرێ.

پێناو: کەسێک کە هەواڵی دوو دڵدار بە یەکتر دەگەیەنێ.

داژیار: رسق، رۆزی، بژێو

داوەتەنە: جاڵجاڵۆکە

دوڵدوڵ: ئەسپەکەی ئیمامی عەلی

دیدڤان: گەواهیدەر، شایەد

تیتلەکناچە: نەورەس

خەنەتیلە: قەوزە

ساپیتە: بنمیچ

ساویر: وەهم

سێ باری نیوە شەوێ: درەنگانی شەو

شەودیز: ئەسپەکەی خوسرەوی پەروێز

زیوا: زەنبەق، گوڵێکی سپی و جوان و بۆن خۆشە

گراوی: یار

گرێنی: گرێمی، خەنجەری گچکۆکە

گژگژە: پووشوپەڵاش

گژگژەک: بەفرخۆرکە، تەزرەی زۆر ورد

گوڵەجوتیارە: گوڵە جوتێرە، گوڵێکە پایزان لە سەروبەندی جووتکردن سەر دەردەهێنێ.

رەڤیڤان: مەیتەر، ئەو کەسەی خزمەتی بەرزە(ماین و ئەسپ...)دەکات

رەخش: ئەسپەکەی رۆستەمی زاڵ

رەمەند: شوورەیێ کە بە بەرد هەڵنرابێ.

لازۆکە: لاوژۆکە، تەنێکی کچەکەیە، لە ناو زەنگوڵەیە، بە لەرینەوەی دەنگی دێ.

نوێژیان: دەمی نوێژی بەیانیان

نێسکە: لەنجەولاری ئەسپ و ماین

هەدبان: ئەسپەکەی دەروێشی عەڤدی

# HESEN Û MRYEM

## Kerîm kake

شکەفتی ئەوین تا بمێنێ، وێنە وێنە، وێنەی حەسەن و مریەم دەپارێزێ و هەمیشە ئەوین دەپژێنێ. لەوێوە چاوێ بە بەستی هەنگویندا بگێڕە. لە سەر باسکێ کارمامزێ دەبینی، شتێکی بە ملەوەیە، ئەوە تیلمێ لە لەوەندیی مریەم و پژدێنی حەسەنە.

لە ڕۆخی بەستی هەنگوین بۆ تاوێ گوێڕادێرن، قرووسکەی سەگێ دەبیستن. ئەوە زەردەیە کە پێناوی بۆ حەسەن و مریەم دەکرد.

چاو بە هەر لایەکدا بگێڕی، تارمایی ئەسپێک دەبینی. ئەسپەکەی ماڵی حەسەنە، ئەسپی ڕازە، ئەسپی فریاد و نیازە. لە سەر گردی خوێنەوە، گوێت لە حیلەی دەبێ. لە بەر دەرکی سەرای شارەوە دەیبینی باڵدەگرێ.

هەوکەش هەموو ساڵێ لە دوادوایی ڕەشەمێ دەم نا دەمێ کۆترەشینکە لە بەری منارەوە قەتارە دەبەستن. بە سەر سەرا و قەڵاتدا دەگەنە گۆڕستانی گەورە. لەوێ کەپرۆکە دەکەن. گۆڕستان دەخەنە بن سێبەرێکی تەنک. کۆترەکان شینی حەسەن و مریەم دەکەن. چاودەنێ لە شێوەی سینگکوتانی ژنان باڵ لێکدەدەن. گوێدەنێ، کەمەکمیان چەند لە سەردوولکە دەچێ.






ناوەندی رۆشنبیری مەم و زین

Mem u zin cultural center

memuzin20@gmail

Mem u zin